# گوڵستانی سەعدی

وەرگێڕاوی

مستەفا سەفوەت

★ ناوی کتێب: گولستانی سه عدی
★ وەرگێرانی: مستەفا سەفوەت
★ چاپی یەکەم ـ سالی ۱۳۸۰ ك
★ چاپی دووەم: سالی ۱۳۷۱ هەتاوی
★ لەسەر رەزامەندی دکتۆر عزالدّین مستەفا رەسول
★ پەخشخانەی ناجی ـ بانە ـ کوردستان
★ تەلەفون: ۲۷۷۰ ـ بانە
★ رووبەرگی: لیتوگرافی ۱۱۰ تاران
★ چاپخانەی: چهر ـ تەورێز
★سەرپەرشتی چاپ: حاجی ناصح ئەفخەم زادە ـ تەورێز

برای زۆر خۆشەویست و بەڕێز
کاک ئاجیی ئەحمەدی
پاش سڵاوی گەرم
بیستم کە نیازی چاپکردنەوەی ئەو وەرگێڕانەی
"گوڵستان"ی سەعدی شیرازیتان هەیە
کە باوکی کۆچکردووم - مەلا مستەفای
سەفوەت کردوویە بە کوردی و بەندە چاپم
کردووە، شادمانم بەو چاپکردنەوەیە و بێگومان
پێم خۆشە و ئەگەر ئەم کارە پێویستی بە ماف
هەبێ ئەوا ئەو مافەتان دەدەمێ و
هەموو شتانە هەر مەبەستمان خزمەتی ئەدەبیاتی
کوردییە، بەڵام ڕەنگە دوو تکام هەبێ
١- ئەگەر پێش چاپکردنەوە کە سێلێ بە قەڵەمی ڕەش
ئیشارەی (٧) لە سەرێتی (و ی ل ٤) دابنێ
کە لە چاپی یەکەمدا کارێکی باشە.
٢- چەند نوسخەیەکم لەو چاپی دووەمە بۆ بنێرن جێی
سوپاسە، ئیتر هەر بژین
براتان
عزالدین
لە قەڵاوە ١٩٩٢/١١/٢٠ د. عیزەدین مستەفا ڕەسوول

# سەرەتای وەرگیر

سوپاس‌و ستایش بو ئەو پەروەردگارەیە کە سەرداری پیغمبەرانی بە بەرزترین پایەی ئەدەب بە هیز کرد ، بە هوی ئەو قورئانەوە کە ئەگەر هەموو کومەلی ئادەمیزادو جنوکە کو بینەوە ناتوانن قورئانیکی لەو جورە بەو شیوەیە بخەنە روو ( قل لـو اجتمعت الجن والانس على أن يأتوا بمثل هذا القرآن لا يأتون بمثله ولو كان بعضهم لبعض ظهيراً). ئەو ئەدەبەی کە تەنیا لە ووتاری کردگارا خوی نیشان ئەداو ، هەموو بویژان‌و نووسەرانی رووی زەمین بە شانازي‌یەوە ، گەوردن کەچ ، پرتەوی ویل‌و شیوەی نووسینی لیوە فیر ئەبن .

دروودو سەلامی بی‌پایان بو گیانی پاکی خاوینی بی‌گەردی هەموو پیشەوایانی ئایین ، بە تایبەتي سەروەری ئەدیبان (محمد) ی کوری (عبدالله) کە فەرموویەتی : «أدبني ربي فأحسن تأديبي» وە بو یارانی‌و هەموو ئەوانەی پەیرەوی ئەکەن تا ئەم گومەزە شینە بە سەر ئەم زەمینە سەوزو رەنگینەوەیەو مانگ‌و روزی ئەتریفیتەوە .

ئەنجا ئەی ئەدیباني کورد لە بویژو نووسەران ، وە ئەی خویندەوارانی هاوزمانم. منالیمەوە کە لە قوتابخانەدا ، پاش خویندنی قورئان‌و ئیسماعیل نامە دەستم بە خویندني (گولستـان ) کرد ، وە بوجاری دووەم بـــە مەعنا خویندم ، لە دەروونمەوە هەستم ئەکرد کە زیاد لە هەموو خویندنیك هـــەوا خواهیم لەگەلیا هەیە ، تا رادەیەك ئەتوانم بلیم چیم لی خویندبوو ، شیعرەکانیم هەمووی لەبەر بوو . دیتە یادم کاتي شەری یەکەمی جیهانی بوو نزیکەی ٤٣ سال پیش ئەمرو ، مەلاکانی ئەودەمە ـ رەحمەتی خوایان لی بی ـ چوو بوون بو سەیران بو ( کاریزی حاجی مەلا عەلی ) . ئەوانەیان لە یادمن (شیخ بابە عەلی) و (مەلا حسەینی پیسکەندی) و (مەلا عبدالعزیزی مفتی ) و (حاجی مەلا رەسوول ) ی باوکمن . ( مەلا حەمدوون ) ی حافزي کویری بلیمەتیش لەوی بوو ، بە باوکمی ووت : ئا مستەفام بو بانگ کە هەر باسی ئەکەیت . باوکم بانگی کردم .

حەمدوون ووتی : شەرە شیعر ناکەی ؟ ووتم: با . نەم ئەزانی حەمدوون کی‌یەو شەرە شیعر چی‌یە ؟ ( شەرە شیعر ئەوەیە کەسێك شیعرێك ئەخوێنێتەوە ، دوا تیپی شیعرەکە چی بێ ، ئەو کەسەکەی تر شیعرێك ئەخوێنێتەوە تیپی یەکەمی ئەو تیپە بێ شیعرەکەی ئەوی پێشووی پێ دوایی هاتووە ) . دەس پێ‌کردنی شەرە شیعر بەم جورەیە : یەکێك ئەلی : بی وە نەستەعین « بە نستعین » ئەوی ئەلی : نەستەعین بە ڤلانە تیپ . با بلێین (ح) . ئەوی کەش شیعرێکی وەك ئەم شیعرە ئەلی :

حەتەم سزایی لە دوورزەخ نی‌یە ، بە عەکسی ئەو

بەهەشتە جیمو ئەسووتیم لـە دووری ئەو لـەیلە

دوا تیپی ئەم شیعرە (هـ) یە . لەبەر ئەوە ئەوی تر بە شیعرێکی وەك ئەم شیعرەی بنەوە وەرامی ئەداتەوە :

هاتە گوێم دەنگی بە زاری‌و شیوەن‌و ئەفغانەوە

وا بزانم شیوەنە کـەوتوتـە کـوردستانەوە

بەم جورە تا یەکێکیان لە شیعر خوێندنەوە ئەکەوی‌و بور ئەخوا .

سی چارەك سەعات لەگەل ( حەمدوون) رویشتم ، جا پەکی خستم . مەلا حسەین ووتی: حەمدوون هیچ هونەر نە بوو . ووتی: بوچ؟ ووتی : تو خوت کوتوو پر شیعر ئەلییت لە تیپە گرانەکانا وەك (پ) و ( ژ ) و (ڤ) و (گ) . ئەو منالە ناتوانی شیعر بلی ، چی لەبەرە ئەوە ئەخوێنێتەوە . حەمدوون ووتی . وایە . حاجی مەلا ئاگاداری ئەم کورە بە . مەبەستم لەم چیروکە ئەوە بوو هەر لە منالیمەوە شەیدای گولستانی سەعدی بووم ، لەبەر خومەوە شیعرم دائەنا ، هەرچەند لە بازاری شاعیرو بویژانا نرخی نەبوو . هـــەر بەو هەستەوە کە ووتارێکی رێك‌وپێك یا چەند هونراوەیەك کە پیشەسازی‌ی هونراوەی تیا بووایە، لە هونراوەی رابواردن ئیتر غەزەل، یا قەسیدە ، لە حەز لی کردن وجوانی‌یا ، یا لە تەصەووفا ، ئەخوێنرایەوە ، هەموو لەشم ئەهاتە هەلپەرکی لە خوشی‌یانا ، ئارەزووم ئەکـرد منیش وەك ئەوە بلیم‌و پی‌ی نەئەگەیشتم . جارێکیان بیستم کە (سەعدی)

لەسەر شیعریك خەلاتیکی قورسیان داوەتی . شیعرەکە ئەمەیە :

برگ درختان سبز در نظر هوشیار        هر ورق دفتریست معرفت کردگار

ئەم شیعرەم زور لا جوان بوو ، لەو وینەیە بەو مناڵی‌یە ووتم :

برگ درختان زرد در نظر اهل درد        هر ورق دفتریست معرفت ذات فرد

باوکم براکانمي بانگ کرد ، بە شانازیو شادمانی‌یەوە بوی بەیان کردن . چین ـ چین هەستو هوشی خوشەویستیی شیعرم زیاد ئەبوو . هەتا بە یەگجار خویندنەوە دوو شیعرم ئەهاتە بەر ، وە لە بیستنی شیعریکی جوان یا ووتاریکی ریكوپیك لەشم لەرزەی تی‌ئەکەوت . تی ناگەم کەسی هەستو شوعووری هەبی چون دلی نایەتە لەرزەو هەلپەرکی بەم شیعرەی ( نالی ) کە ئەلی :

لە خوفی طەلعەتت روژ هەر وەکوو شیت

بە روو زەردی هەلاتو کەوتە کیوان

بە راستي لە شیعري فارسیدا بە شیعري ( کەلیمي هەمەداني ) و لە شیعری پیاوە گەورەکانا بە هی ( عبدالقادری گەیلاني ) ئەکەومە جوولەو کارم تی ئەکەن . بە شیعری یەکەمیان لەشم ئەکەویتە جوولان . بە هی دووەم چاوم پر ئەبی لە گریان . زورم کوشش کرد بو ئەوە لە دیوانی ئەدیبـانا بچمە ریز ، یا هیچ نەبی لە قوژبنیکی دیوانەکەیانا جیم بیتەوە ، بەلام دەسم نەکەوت .

ما کل ما يتمنى المرء يدركه        تجري الرياح بما لا تشتهي السفن

زورم هەولدا هەتا دوو بەرگ فوتووحـاتی یارانی پیغەمبەر ( سەلامي خواي لی بی ) م هونی‌یەوە لـە نزیکەی ٤٥ هەزار شیعردا ، وە قەسیدەی بوردی‌یەم شیعر بە شیعر وەرگیرایە سەر شیعری کوردی ، وە چیروکی میعراجم هونی‌یەوەو ، نامەیەکم هونی‌یەوە لە رەوشتو ژیانی پیغەمبەرو جی‌نشینانیا ، وە نامەیەك لە ئەدەبو ئاموژگاری‌یا بە ناوی ( هەشت بەهەشت ) کە شتیکي زور جوانو بە کەلکە . . هەندی شتی تریشم پیکەوەنا هەر بەو هیوایە، بوم نەچووەسەر . نەشم ئەتواني بە جاری وازیان لی‌بینم ، چونکە (الارواح

جنود مجنـــدة ، ما تعارف منها أئتلف ، وما تناكر منها اختلف ) . ناچار دەستم ئالاندە داوینی دوو پیاوی گەورە چونکە ( المرء مع من احب ) . یەکەم ( عبدالقادری گەیلاني ) خوا لە پیروزیی ئەو بزورگەوارە بیبەشمان نەفەرمویت . دیوانە فارسییەکەی لە زووەوە لە ناو پیاوە گەورەکاني ئایینا پایەیەکی بەرزو پیروزی هەیەو هەر غەزەلیکی بو گەیشتن بە ئامانجی ئەخویندریتەوە ، هاتم کردم بە کوردی ، شیعر بە شیعر وەرمگیرا . وا ئەزانم هەر لە هیممەتی خویەوە بوو ، ئەگینا لە کاتیکی کورتا وەرگیرانی دیوانیك بە شیعر شتیکي ئاسان نییە . بە راستي لەو کاتەدا نەخوشیش بووم ، هەم شیفام پیوەرگرت ، هەم یادگاریکم پی بەجی هیشت . بو نموونە ئەمە یەکەم غەزەلیەتی :

لە دەردا بی بە بی پەردە وەرە کا شانەیي ئیمە
کەسی تیدا نییە ویردت نەبی خو خانەیي ئیمە

ئەگەر تەشریفت بیتـــە سەر گلی ویرانەیي ئیمە
ئەبینی نوقمی خویناوی جگەر بوو خانەیي ئیمە

مەئالوزینە مووی موشکین ، نە ئالوزینی تا ئاشووب
نییـــە توانایي زنجیری دلی دیوانەیي ئیمە

مەلیکی باغەکەی بالامو کەوتووی دەیری ویرانە
کە نووري جیلوەیي باری ئەبیتـــە دانەیي ئیمە

لە ژیر گوریچەیي تەنگا بە یەکتای خوم ئەلیم یا رەب
ئەتوی هـــەر ئاشنامان ، تو نەبی بیگانەیي ئیمە

نەکیر گەر بیت بپرسی لیم بلی کییە خودایي تو
ئە لیم یاری فیراقی وا دلی دیوانەیي ئیمە

بلی بەو مونکیرەی ئەیکا لەسەرمان گریەوو هاوار
هەتا مەحشەر لە گوی دیت گرمەیي مەستانەیي ئیمە

سوپاسی حەق نەمردین تا گەیشتین بەو دلارامە
هەزاران ئافەرین بو هیممەتی مەردانەیي ئیمە

لەبەر شەرقی جەمالی ئەو ئەسووتا (مووحی) ودولبەز

کە ئەیووت سەیرە سەیری هیممەتی مەردانەیی ئیمە

دوای ئەوە ویستم بە هوی گولستانی سەعدي‌یەوە لە باغي نەنجومەنی ئەدیبان چەپکە گولی یا گولی بچنم ، یا هیچ نەبي بونی ئەو گولستانە بچی بە لووتما ، گیانی پی تازە ببیتەوە ئەو گولستانەی کە هەر خوی توانیویە ستایشی بکا کە گوتوویەتی :

روژی گول چەندە ، پینجە یا خو شەش ئەم گولستانە هەر ئەمینی گەش

ئەو گولستانەی بە ئەلماني‌و فەرەنسەیي‌و ئینگلیزي‌و زور لە زمانە بیگانەکانی تر تەرجەمە کراوە ، منیش تەرجەمەی کەم بە کوردي تا برایانی هاوزمانی کوردم لە یرانی ئەم گولستانە بی‌بەش نەبن ، بە تایبەتي کە لە سەردەمی داگیرکردنی عیراق لە لایەن بەریتانیاو ، پیکهاتنی حوکومەتی عیراقەوە لە کوردستاني عیراقا ، خویندنی فارسي باوی نەماوە . لە کاتی خەریك بوونما بە وەرگیرانی گولستانەوە ( عزالدین ) ی کورم کە چوو بوو بو یەکیەتي‌ی سوڤەت بو وەرگرتنی دوکتورا لە زمانی کوردي‌دا ، گولستانیکی لە موسکووە بو ناردم کە تەرجەمەیەکی بە زمانی رووسی لەگەلا بوو . ئەو تەرجەمەیە هی ( روستەم مووسا عەلی‌یف ) بوو . ئەو گولستانەی چاپی سوڤیەت زور شتی وای تیا بوو لەو نوسخانەدا نین کە بە دەستمانەوەن . هەروە هاعزالدین بوی نووسیم کە زور کەس ئوترووحەی دوکتورایان لەسەر گولستانی سەعدي پیشکەش کردووە ، کە یەکی لەوانە دوکتور ( رەحیم سولتانوف ) ی سەرەکی بەشی زمانی فارسي‌و زانای گەورەی روژهەلات ناسە. هەروەها کچیکیش لەم دوایي‌یەدا ئوترووحەی لەسەر گولستان نووسیوە ، وە لە ئوترووحەکەی‌دا باسی کردووە کە تیپی (ب لە گولستاندا بە ٥٨ مەعنا بەکار هینراوە . جا تەماشا کەن بیگانەکان تا چ رادەیەك گولستانیان لا گرنگەو چ پایەیەکی هەیە لایان .

ئەی کوردی خوێندەوار ! هیچ پێویست نی‌یە من ستایشی گولستان بکەم بوت . خوت ئەی خوێنیتەوەو حالی ئەبی چ گەوهەریکە . گولستان هەشت بەشە ، هەر بەشیکی بەیانی شتیك ئەکا لەو شتانەی پەیوەندیان هەیە بە ژیانی ئادەمیزادەوە ، بە شیوەیەکی جوانو ئەدیبانەی وا وەك نەخشی بەرد لە دلا جی‌گیر ئەبی . بە تایبەتی بەشی هەشتەمی شایانی ئەوەیە بە ئاوی ئالتون ، پەندو حیکمەت بە حیکمەت بنووسریتەوە ، وە لە ژوور سەرەوە هەلواسری بە دیوارا .

گولستانم هەر بە شیوەکەی خوی وەرگیرایە سەر کوردی‌یە شیرینەکەی خومان . هەلبەست بە هەلبەستو پەخشان بە پەخشان . تا بە گویرەی دەسەلات ئاگاداری‌ی شەوکەتو رەونەقی بکەم . لام وایە ئەم مەبەستەم لە تەرجەمەکانی بیگانە زیاترە ، چونکە ئەوان هەلبەستەکانیان بە هەلبەست وەرنەگیراوە . ئەم خزمەتە بچکولەیەم خستە روو بو ئەوەی برا کوردەکانم کەلك لە گولستان وەربگرن ، وە تا گەلانی تر بزانن کە کوردیش خزمەتی ئەدەبی روژهەلاتی کردووەو ئەی‌کات .

لەم تەرجەمەیەدا واری‌ئەکەوی لە هەندی شوینا شیعریك ئەکری بە دوان، یا دوو شیعر ئەکرین بە سیان بە پی‌ی پیویستی‌ی شوین ، یا لـە هەندی شیعرا مەبەست بەیان ئەکەمو ووتە بە ووتە وەرناگیرم . ئەم جورە شتانە لە شیعردا چاو پوشی‌یان لی ئەکری .

تکا لـە خوێندەواران ئەکەم لە هەلەو کەم‌وکورتی ببوورن . ئەلین ئەم لە کوی‌و گولستان لە کوی ؟ چونکە یەکەم کورد ئەلی « کالا لە قەد بالا » دووهەم هەرگیز وەرگیرراو ناگاتە پایەی لی وەرگیرراو ، لەبەر ئەوە کە هەر زمانی خاسیەتی تایبەتی‌ی خوی هەیە . بوی بووەتە هوی جوانی‌و رازاندوویەتیەوە ، وە کە گوررا بە زمانیکی تر ئـــەو خاسیەتەی نامینی‌و جوانی‌یەکەی پیشووی ئەفەوتی . لەبەر ئەوەیە زانایانی ئایین ئەلین : دروستە قورئان تەفســـیر بکریتەوەو مەعنای لی‌بدریتەوە ، تا هەموو عالەم تی‌ی

بکات ، بەلام دروست نی‌یە تەرجەمە بکریت چونکە ئیعجازی قورئان لە ووشەو دارشتنە عەرەبی‌یەکەی دایە ، وە کە گوررایە سەر زمانیکی تر ئیعجازەکەی ئەفەوتی . ئەوەندە ئەتوانم بلیم بەگویرەی توانام کوششم تیا کردووە بو ئەوە شتیکی جوانتان پیشکەش بکەمو یادگاریکی شایان بو پاش مردنم بەجی بهیلم تا رەحمەتم بو بنیرن .

**مصطفی صفوت**

١٦ی ذو القعدەی ١٣٨٠

١ی مایسی ١٩٦١

# به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

شانازی بو خوایەك كە فەرمانبەرداریی ئەو هوی نزیكیيەو ، سوپاس بە جیهینانی مایەی زیادیی بەخشنە . هەر هەناسەیەك ئەچیتە ناوەوە تازەبوونەوەیە بو ژیان . وە دیتە دەرەوە حەسانەوەیە بو گیان . جا لە هەر هەناسەیەكا دوو بەخشش هەیە ، وە بو هەر بەخششی سوپاسی پیویستە . ( شیعر ) :

بە دەستو زمان كی ئەتوانی كێ سوپاسی خوایي كە بینیتە جی

( اعملوا آل داود شكراً ، وقليل من عبادي الشكور )

بەندە وا چاكە لەبەر سستی لـە خوی بیسانوو خواهی كا لە دەرگانەی خودا
وەر نە شایانی خوایي ئەو ئەبی كی لە رووی راستیوە بوی بكری ئەدا ؟

بارانی بی پایانی رەحمەتی لە هەر شوینی بە خوروژمو بە تاوە ، وە خوانی نیعمەتو بەخشایشی لە هەرجییەك راخراوە . پەردەی شەرمو حەیای بەندەگانی خوی بە گوناه نادریتو مووچەی مووچە خورانی خوی بە سووچو تاوان نابریت .

ئـەی كەریمی لـە گەنجی پەنهـانی مووچە خورت هەیە لـە گاورو جوو
دوستانت لە كوی ئەكەی بی بەش كە بە دوشمن هەتە نیگاەو روو ؟

بە فەرراشی بای بەیانی فەرموو هەتا فەرشی زمرووتی رابخا ، وە فەرمانی دا بە دایەنی هەوري بەهاری تا كچانی گیا لە بیشكەی زەمینا پەروەردە كات ، وە كەوای سەوزی گەلا بە خەلاتی نەوروزی بكاتە بەر درەختان ، وە منالی لقەكانیان بە هاتنی كاتی بەهار كلاوي گولیان بكاتە سەر . بە هوی دەسەلاتو توانای تەوەوەیە كە خوراكي هەنگ بووەتە هەنگوینی دلكەش ، وە بە پەروەردەی ئەوە تووی خورما بووە بە درەختیكی سەوزی گەردن كەش .

هـەل ئەسوورین مانگ‌و روژو ئاسمان‌و هەورو با
تا تو نانی دەست ئەخەی بیهوشی نەی خوی هوشیار

بو تو وا دین‌و ئەچن فەرمان بەجی دینن هەموو
داخـە گەر تـو جی نەهینی ئەمری ذاتی کردگار

لە سەروەری کائینات‌و فەخری مەوجوودات ، رەحمەتی هەموو عالەم‌و کاکلەی نەوەی ئادەم ، تەواوکەری چەرخی زەمانەوە .

شفیع ، مطاع ، نبي ، کریم قسیم ، جسیم ، بسیم ، وسیم
تکا کارو تکا لی وەرگیراوە بە بەخشایش پەیامبەر ناسرواە

بلغ العلی بکمـاله ، کشف الدجی بجمـاله
حسنت جمیع خصاله ، صلوا علیـــه وآله

گەییە پایەي بەرز بـــە هوی کەمالی
تاریکی‌ی لادا بـــە هوی جەمـالی
شیرین رەوشـتەو جوانـە فەســـالی
ســـەلام لە خوی‌و لە بنەمـــالی

✤ ✤ ✤

قایمە دیواری ئومەت توی هەبی بو پشتیوان
کی لە گیژی بەحر ئەترسی نووح کە بیتە کەشتیوان

بەندەیەکی گوناهکاري پەریشـانی روزگار ، دەستی پەشیمانی‌ی بـە هیوای لی‌بووردنی یەزدانی ، بـو دەرگای خوا هەلبری خوا تەماشای نەکرد ، دووەم جـار پارایەوە ، خوا رووی تی نەکرد . سی‌یەم بەگریان‌و زاری لالایەوە . کردگار فەرمووی ئەی فریشتـانم لەم بەندەیەم شەرمم کرد . من نەبی کی‌ی تری هەیە . ئەوا لی‌ی بوردم‌و هیوایم هینایە جی .

تەماشاکە لەم لوطفە چون رەحم ئەکا

گوناه بەندە ئەیکاتو ئەو شەرم ئەکا

گوشەنشینانی کەعبەی جەلالی ، دانیان بە تەواو نە پرستنیا ناوەو وتوویانە ( ما عبدناك حق عبادتك ) بە پەرستنی شایانی تو نەمان پەرستوویت . ستایش گویانی جەمالی شیرینی ، سەرسام ئەلین (ما عرفناك حق معرفتك) بە راستی نەمان ناسیویت کە شایستەی ناسین بی .

گەر کەسی لیم بپرسی باسی ئەو بی دلی چی لە بی نیشان بدوی

عاشقی کوشتە بی بە دەس مەعشووق کوشتە کی دیویەتی دەمی بزوی

خاوەن دلی سەری بیرکردنەوەی لە یەخەی خوی توند کرد بوو ، لە دەلیای موکاشەفەدا نوقم بوو بوو کاتی هاتەوە هوش ، یەکی لە خوشەویستانی لی پرسی لەو گولستانەدا کە سەیرانت تیا ئەکرد چیت بو هاوریکانت هینا بە دیاری ؟ ووتی لە دلما بو کە گەیشتمە گولستان داوینم پر لە گولکەم بو دیاریی هاوری یانم ، بەلام کە گەیشتمە ناوباخ بونی گولان وەهای سەرسام کردم داوینم لە دەست بەر بوو .

بلی فیر بن مەلانی بەر بەیان عەشقیان لە پەروانە

کە سووتاوو سپاردی گیانی خوي بی دەنگ بە پەروانە

بە لاف هەر کەس کە کریارە مەزانە ئەو خەبەردارە

ئەوەی زانای نیهانی بی لە کونجی ماتو پەنهانە

❦ ❦ ❦

ئەی بلند تر لە قیاسو لە گومانو لە خەیال

هەم لە هەلبەستو لە هونراوی هەموو ئەهلی کەمال

نامەوو دەفتەری عومرم گەییە ئاخری کار

لە یەکەم پایەيي وەصفی تو زمانم بووە لال

## ستایشی پادشاي موسولمانان ئەتابوك
## ئەبووبەکر سەعدي کوری زەنگی

ناوی (سەعدی) کە بە چاکی کەوتوتە ناو دەمی هەموان ، وە ووتاری لە پانایی زەمینا بلاو بووەتەوە ، قامیشە شەکری ووتارەکانی کە وەکو شەکراو ئەخون ، وە پارچە نووسراوەکانی وەکو ئالتوون ئەکرن ، لەبەر فەضلو بەلاغەتی خوی نییە ، بەلکو گەورەی جیهانو قوطبي زەمان ، جی‌نشین سولەیمانو ، پەنای خاوەنانی باوەرو ئیمان ، ئەتابوکی گەورە ، سالاری هەر دوو جیهان ، ئەبوو بەکري کوری سەعدی کوری زەنگی ، سیبەری جیهان ئافەرین لەسەر رووی زەمین ، خوای لی رازی بی ، بە چاوي لوطف تەماشاو پەسەندی کردووە . بویە هەموو زاناو نەزان باوەریان پی‌کردووە . (الناس علی دین ملوکهم) خەلك لە سەر ئایینی پاشایانیان ..

تاکو لوطفی توم لەسەربی من هەمە ناوو نیشان
ناوی من روونتر لە روژی روونە لای خاوەن نەظەر
گەر سەراپایي وجوودی من کەمو کورتە چ باك
تو پەسەندی کەی کەمو کورتی هەموو فەضلەو هونەر

✤ ✤ ✤

گولی روژی لە ناو ژووری حەمامی | لە دەستی خوشەویستی گەییە دەستم
ووتم تو موشکی ئەی گول یا عەبیری | لە بونی دلکەشت سەرسامو مەستم
ووتی سەعدی گلی بووم نەم‌بوو نرخی | بەلام بەینی لەگەل گول دائەنیشتم
جەمالی هەم نوشینی کاری لیم کرد | ئەگین من کەی گولم ، خاکیکی پەستم[1]

(١) لە نوسخەیەکدا ئەم چوار شیعرەی خوارەوە هەیە . بەلام کەسی شارەزای زەوقی سەعدی بی ئەزانی ئەم شیعرانە هی ئەو نین :

ئەگەر من دەوری عالەم خول بخوم جوانیکي وەك تو نایەتە دەستم

ئەی پەروەردگار، موسولمانان بەرخوردارکەي بە مانەوەی ژیانی ، وە دوو چەندانەکەی پاداش‌و ئیحســـانی ، وە بەرزکەیتەوە دوستان‌و فەرمانبەرانی ، وە بفەوتینی دوشمنانی ، بە گەورەیي ئایاتی قورئانی .

دامەزری وولات با بە نگینی ئاگاداری کە رولەی شـیرینی
لقد سعد الدنیا بە دام سعدە وایـــدە المولی بألویة النصر
کذلك تنشـأ لینـة هو عرقها وحسن نبات الارض من کرم البذر
جیهان پی‌ی کامەران بو ، بەردەوام بی کامەرانی‌ی ئەو
بە هیزی کا بە ئالای نەسرەتی خوی ذاتی یەزدانی
نەمامی بنجەکەی لەو بي وەکوو ئەو پی ئەگا بی شکك
نیشانەی توو لە بن تووە بە گویرەی پەندی پیشانی

ئیزدەی پاك‌و بلند ، خاکی پاکی شیراز بە دەسەلات‌و سامی حوکمدارانی عادل ، وە هیممەت‌و کوششي زانایانی بە کردەوە ، تا روژی قیامەت لە سایەی سەلامەتی‌ی ئەودا ئاگاداری بکات ،

ترسی نی‌یە ئیقلیمی فورس ئەمرو لە ئاشووب
تا تو لە سەری گەورە بی ئەی سیبەری یەزدان
دەس ناکەوی ئیمرو لەسەر ئەم رووبی زەمینە
وەك دەرگەبی تو پر لە ئەمن دەرگەوو دەربان
پاسی کە هەمیشە تو دلی بی دەسەلاتان
پاداشت لەسەر ئیمە ، لەسەر حەزرەتی یەزدان

---

بـــە دووسەد کافر بتیکیان هەیە من تەنیا یەك بت وا ئەپەرستم
پیم ئەلـین بوچی ، تو بت پـەرستی کە یارم بت بی چون نەي پەرستم
لەم دەرە منم (سەعدی) دانیشتووم لە خاکی پی‌ی تو بت ئەپەرستم

ئەي خوايە هەتا باوو هەتا خاكە هەميشە
پاريزى لە باى فيتنەكە تو پارسى ئيران

## هوى دانانى ئەم كتيبە

شەويك بيرم لە روژانى رابووردوو ئەكردەوەو ، بو ژيانى فەوتاوم خەفەتم ئەخوارد ، وە بە ئاوى چاو بەردى بيناى لەشم كون ئەكرد ، وە بە لاواندنەوە بو پەريشانى‌ى خوم ئەم شيعرانەم ئەخويندەوە :

هەر دەم نەفەسى لە ژين ئەبى كەم — چى ماوە بە راستى سەير كەم
پەنجا لە تەمەن چوو ، خەو لە چاوى — پينج روژە كە ماوە گەر تو پياوى
بيكار ئەوى روى بوو خەجالەت — بار بەستى‌ى ئەكرد بە تەپلى ريحلەت
نووستى پيش بەيانى بار كردن — دوا ئەخا پيادەكان لە رويشتن
هەر كەسى هات بيناىي تازەى كرد — بوو بە مالى يەكيكى تر ئەو مرد
نەگەرا ئەو يەكەش تيا بە هەوەس — لە جيهان نەيدى كامەراني كەس
يارى نەبي دەوام كەى يارە — ناشى بو دوستى ئەوى غەددارە
كە مايەى ژيان نەبى برسي — تا لە ئيشا بى راستى ناترسى
گەر قەبز بى بە ئيش‌و ئازارى — وە رەوان بى يەقينە بى چارى
چوار تەبيعەت موخاليفى يەكتر — خاك‌و ئاوو هەواو هەم ئاگر
پيكەوە هەل ئەكەن كەمى لە ژيان — يەكى لەم چوارە سەركەوى ئامان
جورى ويران ئەبى بيناىي تەن — گيانى شيرين كە ديتەدەر لەبەدەن
بي گومان پياوى زيرەكى عاقل — بە جيهانى وەها بى نانى دل
لە جيهانا خراپ‌و چاك ئەمرى — ئەو كەسە مەردە چاكە وەرئەگرى
بەشى گورت بنيرە گەر مەبودى — بە تەماى كەس مەبە كە تو مردى
عومر بەفرە لەبەر خورى هاوين — سەركەشى بەسيە وا توايەوە ژين

چوویته بازار ئەگەر بە دەستی بەتاڵ　　دەسرت پڕ نیی‌یە کە دییتەوە ماڵ

کاتی زەرعات نەوی نەکا فرمان　　هیشوە چن بی ئەبی لـــە خەرمانان

بەندي سەعدی بە گوی‌ی دڵت بیبي　　گەر هەتە مەردی ڕوو کەرە سەر ڕي

دوای وورد بوونەوەم لـەم ڕووەوە ویستم بڕیاری تەنیایي بدەم ، وە لـە ڕابواردني ئەمو ئەو داوین بکیشمەوە . وە نامەو ووتاری پەریشانو بلاوم بشومەوە ، وە لەمەولا پڕوپووچ بە دەما نەیەت .

لـە کونجی بە تەنیایی بی‌گوی‌و زمان　　گەلی چاترە بوم لە هاوری‌ي نەزان

تا یەکی لە دوستانی هاوری‌ی کەژاوەو ، هەم نوشینی ژوور وەتاغم وەکو جاران هاتە لام ، بە ڕوو خوشي‌یەوە دەستی کرد بە یاري‌و ووتاری ڕەنگین ، دەم بە پیکەنین ، هەرچی کردو هەرچی ووت وەلامم نەدایەوە . سەرم لەسەر ئەژنوی خواپەرستی هەڵ‌نەبری . لـەم شیوەیەی من وەك ژی کەوان هاتەوە یەكو ووتی :

هەتاکو هـــەتە هیزی بو گفتوگو　　بکە گفتوگو خوش‌و ڕەنگین‌و جوان

کە پەیکی ئەجەل دای بەسەرتا ئیتر　　ئەچیتە کلیلە دەمت بی زمان

یەکی لـە هاوری‌یانم پی‌ی‌وت سـەعدی بڕیاری بی دەنگی‌و گوشـەنشینی‌ي داوە ، هەتا ئەم توزەژیانەی ماویەتي لـــە پڕوپووچا بەکاري ناهینی . جا تویش ئەگەر ئەتواني برو پەیرەوي ئەو بکەو لە هەموو کەس دوور کەوەرەوە . وەلامی دایەوە بە جیهان ئافەرین‌و ڕابواردنی دیرین ، دەم نابزوینم هەتاوەکو جاران نەکەویتە گفتوگو . ڕەنجاندنی دوستان نەفامین‌و نەزانینە ، وە کەفارەتی ســـویند ئاسـانە . بـــیرو باوەري خاوەن عەقلان پیچەوانەي بڕیاری ئەوە ، ذولفەقاري عەلی لە کالان‌و ، زمانی سەعدي لە دەما پەنهان نابی .

چوزانی چی‌یە ، سوالـەتە ، گەوهـەرە　　کە دووکاني داخست جەواهیر فروش

زمانت لـه دەمتا ئەزاني چيبە ؟ کلیلی دەری گەنجي خاوەندی هوش

( پارچـــە )

گەرچي بی دەنگی لەلاي پیری حەکیمان ئەدەبە
کاتی پیویســـتي ئەبی بو وتنت تی‌کوشی

عەقل‌و هوشی بەشەريبەت ئەرووخینن دووشت
کاتی بی دەنگی ، وتن . کاتی وتن ، خاموشی

بە کورتی توانام نەما زمان لە گفتوگوی بگیرمەوە ، وە روو لی وەرگیرائیم بـــە مرووەت نەزاني . دوستیکی ریك‌و خوشەویستیکی راست بوو : ( هونراو )

کەسی نیتە دەرچوون لە ژیر چنگی ئەو
ئەگەر ئەهلی عەقلی مەچو جەنگی ئـەو

ناچار لەگەلیا کەوتمە ووتار ، وە بو رابواردن پیکەوە روومان کردە دەشت ، کاتی بوو بە بەهار دەشتی کرد بوو بە بەهەشت . دوور لە کزەی سەرماو تینی گەرما .

نوری‌بەهشتي جەلالی بوو یانی مانگی نیسان
بولبول بە دەنگ‌و چریکەی نەوا لەسەر لقەکان
لوء لوء لە شەونمی تەرەوە وا لەسەر گولالەی سوور
وینـەی عەرەق کە رژابیتە گونەیي جانان

لەگەل یەکی لە دوستان لە ناو باغ‌و گولستانا ماینەوە ، هەتاکو بەیان لە شوینیکی خوش کە درەختانی دلکەشی تیـا بە یەکا چوو بوون . سەیری زەمینت ئەکرد گویا وردە شووشەی تیا رژاوە ، وە هیشووی تری گەردن لغەو لە گەردنی میوەکان کراوە .

روضة ماء نهرها سلســـال دوحة ســـجع طیرها موزون
پر لە لاولاوە ئەو لە رەنگاورەنگ ئەم پری میوەهایي گوونا گوون
با لە ژیر ســـیبەری درەختانا فەرشی داخستووە هەموو گولگوون

سبەینی کە بیری گەرانە بەسەرمانا زال بوو ، دیم داوینی پر کردووە لـە گول‌و

ریحانەو نەسرینو نازناز، وە هەنگاوی بو گەرانەوەنا . پیم ووت گولیگولزار وەکو ئەزانی ئەوەندە نامینیتەوە ، وە کاتی بەهاریش زوو ئەبریتەوە . زانایان ووتوویانە ئەوەی پایەدار نەبی بو ئەوە ناشي دلی پیـــوە ببەستی . ووتی ئەی چارەم چی‌یە ؟ ووتم بو سەیرانی خویندەوارانو دل کرانەوەی یاران ئەتوانم کتیبیکی (گولستان) دروست بکەم کە بای پـایز دەستی زەبرو زور بو لقو گەلای دریژ نەکاتو ، گەردشی زەمان هەرگیز بەهـاري نەگیری بە پایز .

| | |
|---|---|
| بە چ کەلکت دیت لە گول تەبەقی | لە گولستانی من بیـــە وەرەقی |
| روژی ئەو چەندە پینجە یا خو شەش | ئەم گولستانە هـــەر ئەمینی خوش |

کاتی ئەمەی بیست داوینەگولی رژاندو ، دەستی لە داوینم ئالاند . ووتي (الكريم اذا وعـد وفـا ) واتە بەخشندە پەیمان بدا بە جی‌ی دینی . وا ری کەوتبوو لەو روژانەدا چەند بەندیکم نووسیبوو لە باسی جوان رابواردنو دەستووری گفتوگودا کە ئەگەر بە کار بهینریت بەلاغەتو زمان رەواني زیاد ئەکا . بە کورتي هەندی گول لە باغاما بوو گولستانم تەواو کرد . خوا خوی ئەزانی .

ئەم گولستانە کاتی پەسەندە کەوا بارەگای جیهان پەنای سیبەری کردگارو پرتەوی لوطفی پەروەردگار . گەنجینەی زەمان، پەنای ئەمان، بە هیزکراوی ئاسمان ، زالو یاریدە دراوی سەر دوشمنان ، هیزو دەسەلاتی دەولەت ، چرای رووناکي‌ی میللەت ، شانازي‌ی ئیســـلامو ، جەمالی ئەنام ، سەعدی کوری ئەتابوك شەهەنشای گەورە ، خاوەنی ئومەم ، سەرداری عەرەبو عەجەم . سولتانی زەمینو دەلیـــا ، واریسی مولکی سولەیمان مظفرالدين ئەبوو بەکری کوری سەعدی کوری زەنگی ، پایەدار بی ئیقبالیانو ، زیاد بی ئیجلالیانـــ . رووی لە هەموو چاکەیەك بی دواروژیان ، لە رووی لوطفـو نەوازشەوە تەماشای بکات .

بە سەیری گوشەیەکي چاوی ئەم کتیبە وەکو

نیگارخانەیي چینـــەو نەخشی ئـەرژەنگی

هیوام وایـه نه رەنجی ووتم گولسـتانە
بیتە خوشییو شادی، نە بیتە هوی‌ی دلتەنگی
بە تایبەتی سەرەتای ئـەم نامە پیروزە
بە ناوی سەعدی بووبەکرە، سەعدی کوری زەنگی

## میری گەورە فەخرەددین ئەبووبەکر کوریٔ ئەبوو نەصر

دیسان بیرو هوشی دەماخم وەکو بووکیکی ناشیرین سەر ناهینیتە دەر ، وە چاوی شەرمەزاری لە پشتی پی جیا ناکاتەوە. وە بو ریزی تەماشاکەران خوی دەرناخات، مەگەر ئەو کاتە خشلی قوبوولی میری گەورە، زانای بە عەدالەتو دەسەلاتو هیز، پالپشتی تەختی سەلتەنەتو، راویژکەری راویژی وولات، پەنای هەژارانو دەربەدەران، ماموستاو لەلەی زانایان، دوستی خواپەرستان، هوی شانازیی فارس، قولی بە هیزی پاشاو وولات ( باربوك ) شانازی دەولەتو ئایینی فەریادرەسی ئیسلامو موسولمانان، پـال پشتی شـاهان ئەبوو بەکری کوری ئەبوو نەصر خوا بەرقەرارو پایەداری کا، سـوپاس کراو لە هەموو ئافاقو سەراپای جوانیو ئەخلاق .

کەسی ژیر سیبەری لوطفی ئەوی دەسکەوتی بی شك
گوناهی تاعەتە، زور بەختیارەو دوشمنی دوستە . .

بە هەر یەکە لە بەندەگانی دەوروپشتی خزمەتیکی پی سپیرراوە ئەگەر سستی‌ی تیا بنوینی، دیتە مەیدانی سەرزەنشت، مەگەر ئەم دەستەی دەرویشانە کە سوپاسیان لەسـەر پیویستە وە داوای چاکەی بو بکەن. بەجی هینانی دوعای لەلاوە چاکتر جی‌گیرە چونکە لە روو بەرمایی دوورە .

پشتی چەماوەی سەما راستە لە خوشی کە دی
دایکی زەمان چەشنی تو رولەیی هینایە دی
حیکمەتی رووتە کەوا لوطفی جیهان ئافەرین
پیاوی بنیری بکا خزمەتی رووی زەمین

دەولەتی دەس‌کەوت تەواو هەر کە ژیا نیکناو
ناوی بە چاکی لە دوای ، زیندووی ئەهیلی لە ناو
وەصفت بکەن یا نەکەن ئەهلی فەضل ، رووی جوان
نایەوی ئارایشی بکری بە دەستی ژنان

جـا بەیانی ئەوە ئەکا کە بوچی لە خزمەت سىتیی کردووەو خوی لەو بارەگایـە دوور گرتووە .

سـىتیو خو دوور گرتنم لە خزمەتی بارەگای ئەو گەورەیە لەبەر ئەوەیە کە دەستەیەك لە حوکەمای هیندستان لــە زاناو هونەروەر بوزرجەمەر ئەدوان ، کەم‌وکووری‌یان لی نەدوزی‌یەوە ئەوە نەبی کە زمانی لە گفتوگودا رەوان نی‌یە ، گوی‌گر زور چاوەروان ئەبی هەتا باسی تەواو ئەکات . بوزرجەمەر بیســتیەوە ، فەرمووی : بیر کردنەوە لەوە کەچی بلیم ، چاکترە لە پەشیمان‌بوونەوە لەوە کە بوچیم ووت .

واتە زانی پەروەردەی دەستی پـیر        واتە نالی نەیکا هەتا توزی بـیر
بـە بی بـــیر ووردی مەجولینـە دەم
ئەگەر چاکت ووت دوایش کەوی چ غەم
لە دوای بیر ووردی هەلینە نەفەس        ووتت وا تەواو نەلین ئیتر بەس
بەشەر لە حەیوان چاکترە هەردەم        کە خراپی ووت خراپترە ئـەم

ئەگەر لە ئاستانی ئەو گەورەیەدا کە جی کوبوونەوەی خاوەن دلان‌و مەرکەزی زانایانە ، لە گفتوگودا پالەوانی بکەم سەرکەشی‌یە ، وە هوی کەم هینانە بو بازاری عەزیزی میسر . لە بازاری گەوهەر فروشانا دەنکە جویەك نرخی نی‌یە . چرا لە بەرابەری روژا پرتەوی نی‌یە . منارە لە داوینی‌چیای ئەلوەندا پەست ئەنوینی .

سـەعدی پیریکە بیری ئازادە        کەسی نایەتە جــەنگی ئیفتادە
چاکە بیر کەیتەوە لە پیش گوفتار        پایـە دانان خرایە پیش دیوار
دار ئەنیژم نە وەك لە ناو باخانٔ        هەمە جوانی نە وەك لە ناو کەنمان

له لوقمانیـان پرسی له کیوه حیکمەت فیر بوویت ؟ ووتی لەکویرانەوه ، هـەتا جیگه پی نەدوزنەوه پی دانانین (قدم الخروج قبل الولوج) هـاتنه دەرەوه پیش چوونه ژوورەوه . پیاوەتیت تاقی‌کەرەوه ئەنجا ژن بینه (پارچه) :

گەرچی چالاکه له جەنگا کەلەشیر  ناگری بەرگه له چنگ بازی دلیر
بو مشك شـیره پشیله ، بەلام  مشکی مەیدانی پلنگه یا شـیر

بەلام پشتم بەوه قایمه که چاو له کەم‌وکورتیی ژیردەستانی ئەپوشی، وه بو بلاو کردنەوەی سووچی بەردەستانی تی ناکوشی . لەبەر ئەوه به کورتي لەوتەی نەســـتەق‌و نموونەی رەوشتی پاشایانی رابوردوو - خوایان لی خوش‌بی - لەم کتیبەدا هەندی لـــه تەمەنی گرانمایەم بەخت‌کرد . ئەمه بوو هوی پیکەوەنانی گولستان .

برا هەلبەستی ئیمه هەر ئەمینی  که گەردی خاکی ئیمەوا له شوینی
بمینی یادگاری نەخشی دەسـتم  ژیانی وا نەبی خوی نانوینی
هیوام خاوەن دلیکه مەرحەمەت‌کا  دوعا یا فاتیحا بو من بخوینی

به کورتی سەیری ئەم کتیبەم کرد وه له بەندەکانی ورد بوومەوه بو ئەوه ئـــەم گولزارەگەشه وه ئەم باغچەی درەختانی‌سەرکەشه وەك بەهەشت لەسەر هەشت ری‌کەوی، وا به کورتي بەندکانی بەیان ئەکەم :

لـــه کاتیکا وەختی ئیمـــە خوش بوو
له هیجرەت شەش‌صەدو پەنجاوو شەش بوو
من ئاموژگاریی خـومم کرد بـرا وا
ئەروم‌و ئیوە ئەسپیرم بـــە دەس خوا

# بەندی یەکەم رەوشتی پادشایان

۱ــ (چیروك) بیستم پادشایەك بە کوشتنی دیلی فەرمانی دا . ئەو بیچـارەیە لەو حالە بی هەوایی‌یەدا بە زمانی کە هەیبوو پادشـای داگرت بە جنیوو وتاری سووك ، وەك وتراوە هەر کەسی دەس لە گیانی خوی بشوا هەرچی لە دلی‌دا بی ئەیلی .

اذا يئس الانسان طال لسانه      كسنور مغلوب يصول على الكلب

کە ئادەمی‌بی هەوا بوو زمان دریژ ئەکا ، وەك پشیلەیەك زوری لی‌کرابی پەلامار بەری بوسەرسەگ . (تاك)

کەوتیە تەنگانە نەما ریی فـیرار      دەست بـدە شمشیر برو کارزار

پادشا پرسی ئەمە چی ئەلی ؟ یەکی لە وەزیرانی پاك‌سروشتی ووتی : ئەی پادشـام ئەمە ئەلی « والكاظمين الغيظ والعافين عن الناس » .

پادشا دلی نەرم بوو ، بەزەیی پیـــاهاتەوە ، دەستی لە کوشـــتنی هەلگرت . وەزیریکی‌تری لەگەل ئەم وەزیرەدا ناریك بوو ، ووتی : بو ئیمە ناشی لە خزمەت پادشادا بە راستی نەبی بدویین . ئەمە جنیوی بە پاشاداو ناشایستەی ووت . پادشا لەم ووتارە وەك ژی‌کەوان هاتەوەیەك‌و ووتی ئەو درویەی ئەو لای ئیمـــە پەسەندتر بوو لەم راستەی تو ووتت ، چونکە دروکەی ئەو رووی لە ئاسایش بوو وە کەلکی هەبوو ، وە راستەکەی تو بینای لەسەر پیسی‌بوو . زانایان ووتوویانە درو بو ئاسایش چاترە لە راســـتی بو ئاشووب

شا به گوفتاری تو بکا کردار داخه چاکی نه‌بی بکه‌ی گوفتار

له تاقی هه‌یوانی فه‌ره‌یدوون نووسرابوو :

جیهان بی‌به‌قایه‌و نی‌یه پایه‌دار ئه‌گه‌ر عاقلی دل بده کردگار

له دنیـــا مه‌که ته‌کیه‌وو پالی پشـــت

گه‌لی چه‌شنی توی پی‌گه‌یاند گورجی کوشت

له زویشتنا وه‌ك یه‌که گیـانی پاك له‌سه‌ر ته‌خته‌مردن وه‌یا روویی خاك

٢ـــ (چیروك) یه‌کی له پادشایانی خوراسان ســـولتـان مه‌حموودی کوری سوبوکته‌گینی له خه‌وا دی هه‌موو ئه‌ندامه‌کانی بووبوون به خاك ، مه‌گه‌ر چـاوه‌کانی هه‌روا له کالانه‌ی چاویا ئه‌گه‌ران‌و ته‌ماشایان ئه‌کرد . زانایان‌و حه‌کیمان له مه‌عنـای ئه‌م خه‌وه سه‌رسام بوون ، ده‌رویشی مه‌عنای لی‌دایه‌وه ووتی ئیسـتاش دل‌ته‌نگ‌و ره‌نجیده‌یه چونکه مولکه‌که‌ی به ده‌ستی ئه‌م‌و ئه‌وه‌وه‌یه .

گه‌لی نامه‌وه‌ر مردو رووی کرده گور له‌ســـه‌ر رووی زه‌مینا نیشانی نه‌ما

که‌لاکی گه‌لی که‌س سپیررا به خاك رزی پیســـت‌و ئیسقانه‌کانی نه‌ما

عـــه‌دل ناوی نه‌شیره‌وانی ژیاند ئه‌گه‌رچی ده‌میـــکه ژیانی نه‌ما

هه‌لیکه زه‌مان کوششی چاکه‌که له پر بانگ‌ئه‌که‌ن وا فلانی نه‌ما

٣ـــ (چیروك) بیســـتم شازاده‌یه‌ك کورته بالاو بی روالـه‌ت بوو ، براکانی بالابه‌رزو لاو چاك بوون . جاریـــکیان باوکی به روو گرژی به سووکی سه‌یری کرد . کوره وریا بوو ، تی‌گه‌یشت . ووتی بابه کورته بالایه‌کی خیرومه‌ند چاکتره له دریژیکی بی‌خیری بلند . وه نه‌بی هه‌رچی بالای به‌رزتربی نرخی زیاتر بی (مه‌ر پاکه‌و فیل پیسه).

اقل جبال الأرض طور وإنه لأعظم عند الله قدراً ومنزلاً

بچووکتریی کیوانی زه‌وی کیوی تووره ، که‌چی قه‌درو پایه‌ی لای خوا له هه‌موو چیاکان به‌رزتره . بوچ نه‌ت‌بیستووه روژی له روژان دانایه‌کی زه‌بوون به نادانیـــکی مل‌هوری ووت :

ئەسپ تا ناو قەدی باریك بی چاکە　　لە روژی شەر نەوەك گایيکی ئەستوور

باوکی پیکەنی‌و پیاوانی دەولەت شادمان بوون براکانی دلگیر .

بی‌دەنگ بی‌کەسی، گرانە بکەیت　　کورتی‌و هونەری لە یەکتری جیا

هەر بیشە مەزانە وا بە تالە　　رەنگە کە پلنگی نووستبی تیا

بیستم لەو روژانەدا دوژمنیکی زورو بی‌ئامان هاتە سەر پادشا . کاتی هەردوو سوپا بەرامبەر یەك وەستان‌و پیاوانی جەنگ بانگ‌کران بو شەر ، یەکەم کەس هەلی کوتایە مەیدان ئەو کورە بوو ووتی :

گەر کەسیکت دی کە پشتی کردە شەر من نیم ئەوە

من ئەوەم سەیری سەریکت کرد کە نوقمی خوین‌و خاك

مەردی جەنگاوەر بە خوینی ئالی خوی یاری ئەکا

هەر کەسی رای کرد لە جەنگا لەشکریکی کرد هیلاك

ئەمەی ووت‌و دای بەسەر سوپای دوشمنا . چەند پالەوانیکی کوشت‌و گەرایەوە. خاکی ژیر پی‌ی باوکی ماچ‌کردو ووتی :

ئەی ئەو کەسە سەیرت کە ئەکردم بە کەم‌و سووك

وا تی‌مەگە زل خاوەنی مەردی‌و هونەری بی

بو شەر دەس ئەدا ئەسپی رەسەن ناو قەدی باریك

گا جووتی کە دابەستە بی کی دی سەمەری بی

ئەگیرنەوە سوپای دوشمن زور بوو ئەمـان‌کەم . دەستەیەك تەمای راکردنیان هەبوو . کورە تی‌ی گرماندن ووتی ئەی دلیران تی‌کوشن تا جل‌وبەرگی ژنان نەپوشن . بە جاری پەلاماریان برد . هەر لەو روژەدا سوپای دوژمنیان شکاند . باوکی ناوچاوانی ماچ‌کردو گرتیە باوەش . روژ بە روژ زیاتر ئەماشای ئەکرد ، هەتاکردی بە جی‌نوشینی خوی . براکانی بەخیلی‌یان پی‌برد ، زەهریان بو کردە ناو خواردنەوە ، خوشکیکی

ئاگاداربوو دوو دەریی دا بەیەکدا . کورە تیگەیشت ، دەستی لە خواردن هەلگرت‌و ووتی ناشی هونەرمەندان بمرن‌و بی‌هونەران جیگەی ئەوان بگرنەوە .

هیچ کەسی ناچیتە سایەی کونەبوو     با لە دنیاشا نەمینی هیچ هوما

باوکیان لەم کەین‌و بەینە ئاگادارکرد . براکانی بانگ‌کردو هەریەکە شایانی خوی شەپازلەی وەرگرت . جا هەریەکە شتیکی بو دیاری‌کردو روو بەو شوینە رەوانەی‌کردن . بەم جورە ئاشووبی دامرکاندەوەو ئاگری کوژاندەوە . دە دەرویش لەسەر کلیمی جی‌یان ئەبیتەوەو ، دوو پادشا لە ئیقلیمی پیکەوە ناگونجین .

پیاوی خوا نانیکی بی نیوەی ئەخوا     نیوەکەی کەی ئەو ئەداتە بی نەوا
پادشا گەر ولکەییکی دەس‌کەوی     تیری پی ناخوات‌و ولکەی کەی ئەوی

٤ــ ( چیروك ) دەستەیەك لە دزانی عەرەب سەر شاخیکیان گرتبوو ، ریگەی کاروانیان بردبوە بەست . دانیشتووانی شاران لە فیل‌و تەلەکەیان هەراسان بوون ، لە هەر شەریکا لەشکری پاشایان ئەشکاند ، چونکە لەسەر کیویکی بەرز قەلایەکی قایمیان دروست کردبوو . دانایانی ئەو وولاتە کەوتنە راویژ، ووتیان ئەمانە ئیشیان هەروا بمینی، دەسەلات زوریان لی‌نەسینی ، ئیتر بەرابەرییان ناکریت .

نەمامی کە تازە روابی ئەگەر     یەکی دەستی دایە بەهیز ، دیتەدەر
ئەگەر لی‌ی گەرییت تا رەگ‌و بن ئەنی
زەمانە لە جیی خویی هەل‌ناکەنی
بەری جوگە ئاسانە بگری بە بیل     بوار ناداگەر لی‌ی گەری‌ی بی بە سیل

بەم جورە بریاریان‌دا یەکیکیان ناردە ناویان هەتا هەلیکیان بو دەس تەکەوی : ئەم پیاوە لە ناویانا مایەوە ، تا روژی چوونە سەر تیرەیەك‌و جیگەکەی خویان چول‌کردبوو . کومەلی لە پالەوانان خویان پرچەك کردوو رویشتن لە نزیك قەلاکەیان خویان لە بوسە دا . کاتی دزەکان بە تالانەوە گەرانەوەجیی خویان ، تالانیان هەلرشت‌و چەکیان دانا ، یەکەم دوژمنی کە دای بە سەریانا خەو بوو تا هەندی لە شەو بە سەر چوو.

جورمي روژ کەوتە دەمی سیاپی    یونسی قووت‌دا ماسی‌ی دەلیلی

دلاورەکان لە بوسە هاتنە دەرەوە پەلاماریان‌دا هەموو دەسگیر کران‌و یەکەیەکە بالیان بەستراو هینانیان بو لای پادشا . پادشا فەرمانی دا بە کوشتنیان . دەس‌کرا بە کوشتنیان ، هەتا یەکی مابوو هینایانە مەیدانی کوشتن نەوجوانی بوو تازە پی‌گەیشتوو . یەکی لە وەزیران پیچکەی تەختی پادشای ماچ کردو ووتی پادشاهم ئەم نەوجوانە لە باخی کامەرانی بەرخوردار نەبوەو خوشی‌ی لە ژیان نەدیوە . هیوام بە رەوشتی شیرینی تو وەهایە ئەم گەنجە ببەخشی‌و ئەم کویلەیەی خوت دلشاد بکەیت . پادشا لەم وتارە هاتەوە یەك چونکە ریکی بیروباوەری بەرزی ئە، نەبوو ، وە فەرمووی :

لە چاکە دوورە بەد رەگەزو پیاوی جەربەزە

نا ئەهل‌و تەربی‌یەت بەمەسەل گویزو گومەزە

وا چاکە ئەمانە بناغەیان لە بن دەربینی چونکە ئاگرکوژاندنەوەو پشکو بەجی‌هیشتن ، مار کوشتن‌و توولەمار بەخیوکردن فرمانی هوشیاران نی‌یە .

بە خورژم هەور ئەگەرچی ئاوی هوی ژینە ئەبارینی

کەسی نەیدیوە داری بی کە روژی میوە بروینی

لەگەل ئینسانی بەدخوو تو مەفەوتینە ژیانی خوت

لە قامیشی حەسیر کی توزی شەکری توانی دەربینی

وەزیر بە خوشی‌و ناخوشی ووتاری پادشای پەسەند کردو ئافەرینی لی‌کرد . بەلام ووتی بەلی: ئەوەی پادشا فەرمووی وەهایە ، ئەگەر لەگەل ئەو بەد سروشتانەی رابیواردایە پەیرەوی ئەوانی ئەکردو ئەبوو بە یەکی لەوان . بەلام ئەم کویلەیە هیوادارە ئەگەر لەگەل رەوشت چاکانا راگیریت‌و ئاگاداری‌ی بکریت ، خوورەوشتی هوشیاران ئەگریت . ئەمە هیشتا منالە ، میشکی بو وەرگرتنی چاکە بەتالە . سەرکەشی‌ی ئەو بەدسروشتانە دەماری تیادا نەکوتاوە . حەدیث ئەفەرمویت : «کل مولود یولد علی الفطرة ، وابواه یهودانه ،

او ينصرانه او يمجسانه » واته : هەموو منالى لەســـەر سروشتى راستى لە دايك ئەبى . باوك‌و دايكى يا ئەى‌كەن بە جوولەكە يا بە گاور يا بە ئاگرپەرست .

بوو بە هاورىى خراپەكەر كورى نووح　　خانەدانى پەيامبەرىى فەوتان
ســـەگى يارانى غار چەند روژى　　كەوتە دواى چاكەكان بووە ئينسان

كە وزير ئەوەى‌ووت كومەلى لە هاونشينانى شا ياريدەى وەزيريان‌داو بوون بە تكاكار لەگەليا . پادشا ووتى : وا بەخشيم بە ئيوە ، هەرچەند لەلام باش نەبوو .

چى بە روستەم‌ووت ئەزانى پيرەزال　　سووك‌و بيچارە نەبى دوشمن لەلات
ئاوى كانى وردەوردە زور ئەبى　　تا بـە جورى وشـترو بارى ئەبات

بە كورتى ئەم كورەيان بەناز پەروەردەكردو ماموســـتايان بو راگرت ، وە بو رابواردنى ناو ديوانى پادشـا چى پيويست بوو فيريان‌كرد ، تا ئەندازەيەك لەلايەن گەورانەوە پەسەند كرا . روژى وەزير رەوشتى جوان‌و خووى بەرزى ئەم‌كورەى بو پادشا ئەگيرايەوە ، ووتى قوربان بە تەواوي خووى ئەوانى لى دووركەوتوتەوەو ، شيوەى چاكانى گرتووە . پادشا زەردەخەنەيەك گرتى‌و گوتى :

بيچوە گورگ هەرگيز نابى بە بەشەر　　هەرچەند لەگەل پياو ژين بەريتە سەر

چەند ساليكى بەسەراچوو . كومەلى لە دزو دروزنانى گەرەك لى‌ى‌گردبوونەوەو ، بريارى هاورىيى‌و برادەرىيان لەگەل‌دا . تا لە هەليكا وەزيرو هەردوو كورەكەيان كوشت‌و چى ســامانى هەبوو هەموويان بردو روويان كردە اووتكەى شاخەكە . شـوينى جەردەكانيان گرتەوەو ياخى بوون . پادشا پەنجەى پەشـمانيى بەدانگەست‌و ووتى :

لە ئاسن هيچ‌كەسى شمشيرى چاكى‌لى‌نەگرتە دەس
بە زەبرى تەربىيەت كى ديويە نائەهلى ببيتە كەس
سروشتى پاكى باران لاى هـەموو دانايە رووناكە
لە خاكا لالە ئەروينى‌و ، لە شورە درك‌و دال‌و بەس

✤ ✤ ✤

زەمیـــنی شورەکات گول ناروینی    خەریك بوونت لەگەلیا نارەوایە
لەگەل ئینسانی پیسا چاکە هەر وەك    خراپە دەرحەقی چاکان وەهایە

٥ـ ( چیروك ) سوپاسالار زادەیەکم لە سەرای ئوغلمیش شا دا دی ، بە فامو هوشو تیگەیشتوو وریا . لە جوانییا نموونەی زیرەکیو عەقل لـــە ناوچاوانیا ئەدرەوشایەوە .

لەبەر هوشمەندی لە بالایی سەر    ستارەی بلنـــدی بووە شوعلەوەر

بە کورتی لەبەرچاوی پادشا پەسەندهات ، چونکە جوانیو شیوەو رەوشتی هەردوکیان یەکیان گرتبوو . پیاوی ژیر فەرموویانە : دەولەمەندی بە دلە نەوەك بە مال ، گەورەییش بە عەقلە نەوەك بە سال .

هاوریانی بەو پایە بەرزەی حەسەدیان بردو بە خەیانەت لەکەداریان کرد ، وە بو بە کوشتدانی کوششیکی گەورەیان نواند .

هەتاکو دوستی من وا میهرەبانە    چ باکم جرتو فرتی دوژمنانە

پادشـــا لیی پرسی هوی دوژمنایەتیی ئەمانە چییە ؟ ووتی لە سایەی دەولەتی پادشای گەورەوە ـ خوا مولکی پایەدارکات ـ توانیومە دلی هەموان بهینمەجی ، حەسوودان نەبی کە دلیان بەجی نایەت بە نەمانی نیعمەتی من نەبیت کە لە سایەی دەولەتی ئەو خاوەن شکوهەدا هەر بمینی

لە دەستم دی نەرەنجینم دلیکەس    بەلا چی بکەم حەسوود خوی کولەوارە
دە بمرە ئەی حەسوود رزگاربی بەلکو
هەتا نەمری ، دلت هەر پر جەخارە

✤ ✤ ✤

بەدسروشتان کەی هەیانە ئارەزوو    هیچ کەسی دەستی کەوی سامانو جاە
شەمشەمەکویرە ئەگەر نامینی روژ    روژی رەخشان چی هەبە سوودو گوناە

سەدهەزار چاوی وەها کویریت و نەك
روژی رووناك وونبکات پەردەی سیاه

٦ــ (چیروك) لە پاشایەکی عەجەم ئەگیرنەوە کە دەستی جەورو ستەمی بو مالی هوزەکەی دریژ کردبوو، وە ئەو کەلە بەسەزمانەی بە جەورو ستەم داگیرکردبوو. هەتا ئەندازەیەك بو رزگاری دەستیان کرد بە چول کردنی وولات و ریگای دەربەدەرییان گرتەبەر. کاتی دەغل و دان رووی کردە کەمی و گەنجینەی پادشا بی مال و بەتال مایەوە دوژمنانی وولات بەهەلیان زانی لە هەرلاوە پەلاماریان هینا.

کەسی مەیلی هەیە فریارەسی بی روژی چەنگ و شەر
لە کاتی شینەیی خزمەت بکا چی ژیرەدەستاتە

غولامی حەلقە گوی‌ی خوت گەر نەلاوینی ئەبی یاخی
بە لاواندن ئەبیتە حەلقە گوی‌ی تو خوو و بیگانە

روژی لە دیوانی پادشا نامەیان ئەخویندەوە باسیان لە زورداری‌ی زوحاك و ذەوری فەرەیدوون ئەکرد. وەزیر لە پادشای پرسی هیچ ئەتوانی بزانی فەرەیدوون کە گەنج و سامانی نەبوو وولاتی چون بو دامەرزا؟ پادشا ووتی وەکو گویت لی‌بوو عالەمی لی‌کوبوونەوەو پشتیوانی‌یان کردو پادشایی دەس‌کەوت. وەزیر ووتی ئەی کە ئەزانی کوبوونەوەی عالەم پادشایی دەس‌ئەخات بوچی عالەم لە خوت ئەتەکینیتەوەو دەربەدەریان ئەکەیت؟ هەلبەت هیوای پادشاییت نی‌یە.

وەها چاکە بیکەی سوپا پەروەری    کە پادشا بە لەشکر ئەکا سەروەری

پادشا ووتی هوی کوکردنەوەی گەل و سوپا چی‌یە؟ وەزیر ووتی سوپا لە پاشا بە بەخشش کوئەبیتەوە، وە پادشا ئەبی دل‌نەرم و بە رەحم بی هەتا لە ژیر سایەیا بە ئاسایش و دلنیا بژین. تو ئەم دوانە هیچیانت نی‌یە.

کەی ستەمکاری‌یە لە سولتانی    کی بە گورگی سپاردووە شوانی

پادشایەك درەختی جەوری رواند　　پایەیی تەختو تاجی خوی رووخاند

ئەم ئاموژگاری‌یە ریکی سروشتی درشتی پادشا نەبوو ، لی‌ی توورە بوو ، فەرمانی‌دا بە وەزیرانی لە بەندیخانەیان توندکرد . زوری پی‌نەچوو ئاموزایانی پادشا بو بەرامبەری کردنی پادشا راست‌بوونەوە ، داوای وولاتی لە باوك جی‌ماوی خویان‌کرد . دەستە دەستە ئەوانەی لە ستەمی پادشا دەربەدەر بووبوون لی‌یان گردبوونەوەو کومەکیان پی‌کردنو وولاتیان بو داگیرکردن .

شەهی زورو ستەم بی‌خووی بەرامبەر ژیر دەستانی
لە جەنگا دوستانی لی ئەبیتە دوژمنی گیانی
ئەگەر ریك بی لەگەل‌گەل دلنیا بە تو لە هەر دوژمن
کە ئەو هوزە سوپای پادشایە روژی مەیدانی

٧ــ (چیروك) پادشایەك لەگەل کویلەیەکی عەجەمالــــە پاپورا دانیشتبوو ، کویلە دەلیای نەدیبوو ، وە سەغلەتی ناو پاپوری تاقی‌نەکردبوەوە . کەوتە شیوەنوزاری‌و هەموو لەشی هاتبوە لەرزین . پادشا رابواردنی لی‌تال‌بوو ، دلخوشی‌یان ئەدایەوە ، ئارامی نەئەگرت . ئەم حالە ریکی سروشتی ناسکی پادشا نەبوو تی‌گەیشتوویەك لەو پاپورەدا بوو، ووتی ئەی پادشا ئەگەر وازم لی‌بینن ریگەی بی دەنگ‌بوونی ئەمە ئەزانم . پادشا ووتی پیاوەتی‌یەکی گەورەم لەگەل ئەکەیت . پیاوە داناکە کویلەکەی هەلگرتو فری‌ی‌دایە ناو دەلیاوە ، دوو سی جار نوقم‌بوو ، ئەنجا مووی سەری‌گرتو هینایە دەری وخستیەوە ناو پاپورەکە . کویلەکە بی‌دەنگ لە قوژبنیکا دانیشت ، ئیتر هیچ دەنگی لیوە نەهات . پادشا لەم کردەوەیە سەرسام بوو ، پرسیاری لی‌کرد ئەمە چی بوو ؟ ووتی ئەی پادشا ئەم کویلەیە هیشتا ترس‌و سەغلەت‌و نوقم بوونی دەلیای نەدیبوو ، لەبەر ئەوە قیمەتی پاپوری نەئەزانی . بەلا دیدە قیمەتی سەلامەتی ئەزانی‌و نەخوش قیمەتی لەش‌ساغی .

کە تو تیری ، لەلای تو نانی جو ناخوش‌و بی تامە
لەلای تو ناشیرینە ئەو کەسەي لای من دلارامە

لەلای حوریی بەهەشت (ئەعراف) یەقین وەك دوزەخ ئەنوێنی
لەلای دانیشتوویی دوزەخ بەهەشتە جێگەی ئیکرامە

* * *

چون ئەبی یەکسان کەسی گرتوویەتە باوەش نیگار
بو کەسی چاوی لەبەر دەرگا بڕیوە چاوەنوار

٨ــ (چیروك) لـە هورمزیان پرسی لە وەزیرەکانی باوکت چ تاوانیکت دی کە هەموویانت خستە بەندیخانەوە ؟ ووتی تاوانیکی ئاشکرایان نەبوو ، بەلام دیم ترس و سامی من لە دلیانا زور بوو ، بە پەیمانی من دلنیا نەبوون . ترسام بو رزگاریی خویان لەم ترس و هەراسەیان بو فەوتانم کوشش بکەن . پەیرەوی ووتاری حەکیمانم کرد کەوتوویانە :

بترسە لەوەی لیت ئەترسی حەکیم سـەدی وا لەگەلیا بچیتە نەبەرد
ئەبینی پشیلە کە قین بگری چون پلنگ کویر ئەکا چاوي دینیتە دەر
لەوە ئەیگەزی ئەژدەها قاچی شوان لە ترسا کە کەللەی ئەهاری بە بەرد

٩ــ (چیروك) یەکی لە پادشایانی عەجەم نەخوش بوو ، هیوای ژیانی نەمابوو ، لەو کاتەدا سواری بە پرتاو هـات مژدەی دایە کە لە سایەی پاشاوە فلان قەلامان گرت و هەموو دوژمنانمان بە دیل گرت . دانیشتووانی ئەو وولاتە هەموو ئیستا گەردن کەچی فەرمانی پادشان . پادشا هەناسەیەکی ساردي هەلیشکاو ووتی ئەم مژدەیە بو من نی یە ، بەلکو بو دوژمنانی منە کە دواي من وولاتیان ئەکەویتە دەست .

تەمەنی شـــیرین بەو هیوایەوە داخی گرانم وا برایـــەوە
کاتی ئەمدەنی مژدە بـە هیـوا تەمەنی شیرین ناگەریتە دوا

* * *

تەپلی بارکردن خەریکە لی ئەدا دەستی ئەجەل
ئەی دوچاوی من بکەن ئیوە دوعاخوازی لەسەر

دەستو بازوو قولی من ئیوەیش دوعاخوازی بکەن

یەك لەگەل یەکتر ئەوا ئاکامی مەرگم گەییە سەر

مەرگی من بوو کامی دوژمن دای بەسەرما دوستان

سا وەرن یەکیەك بە بەرچاوما بکەن ئیوەیش گوزەر

من بە نادانیو نەفامی روزگارم چوو لە دەست

ئیوە ئاگاداری خوتان بن ئەمانو ئەلحەزەر

١٠ــ (چیروك) لە زوور سەری مەرقەدي یەحیا پیغەمبەردا ـ سەلامی خوای لی‌بی ـ لە ئیعتیکافا بووم لە شام یەکی لە پادشایانی عەرەب کە بە بی ئینصافی ناوی دەرکردبوو وا ری‌کەوت هاتە زیارەت ، نویژی کردو لە خوا پارایەوەو نیازي داواکرد

کویلەی ئەم دەرەن هەژارو زەنگین بە نیازترن دەولەمەندترین

ئەنجا بە منی ووت لەو شوینە کە جیي هیممەتی دەرویشانەو راستی‌ی کردەوەیانە منتان بە دلا بیت ، چونکە لە دوژمنیکی گران ئە ترسام . پیم‌ووت بە گەلی بی هیزت رەحم بکە هەتا لە دوستی بە هیز زەحمەت نەبینی .

بە دوو بازووی تەواناو بە هیزی پەنجەیی دوو دەست

خەتایە پەنجەیی بی‌هیزو لاوازت کە بشکینی

لەپی‌کەوتوو ببینیو لیي نەبووري دیارە ناترسی

لە پی‌کەوت خوی لە بو دەس‌گوتنی کەس دەستی بو بینی

کەسی تووی بەدی‌ی چاندو تەمای بوو چاکە بەرهەم بی

دەماغی بلحو بی کەلکە خەیالی پووچ ئەجوولینی

لە گوی‌ی خوت لوکە دەربینەو بپرسە وادی ئەم خەلکە

ئەگەر نەپپرسی دادرەس بو سبەینی تولەی ئەستینی

✤ ✤ ✤

ئینسان ئەندامی لەشی یەکترن لە ئەصلی سروشت لەیەك گەوهەرن
کە ئەندامیکی ئازاردا روزگار هیچ ئەندامی‌تر نـای‌مینی قـەرار
لە دەردی کەسان کە تو بی خەمی ناشی کە ناوت بنین ئادەمی

۱۱ـــ (چیروك) دەرویشیکی دوعا قوبوول لە بەغدادا پەیدابوو. حەججاجی کوری یوسفیان ئاگادارکرد، بانگی‌کرد پی‌ی‌ووت دوعایەکی خیرم بو بکە. ووتی خوایە گیانی لی‌وەرگرەوە، ووتی لە ری‌ی خوادا ئەمە چ دوعایەك بوو، ووتی ئەمە دوعای خیربوو بو تویش‌و بو هەموو موسولمانان.

ئەی زەبەردەستی ژیردەس بە ئازار تاکەی بمینی وا گەرم بازار ؟
چ کەلکی هەیە بوت جیهان‌داری بمری چاکە، نەك مەردوم ئازاری

۱۲ـــ (چیروك) یەکی لە پادشـا بی‌ئینسافەکان لە خواپەرستیکی پرسی لە عیادەتەکانا کامەیان پاداشی زورترە؟ ووتی بو تو خەوی نیوەرو، تا لـەو دەمەدا ئازاری کەس نەدەیت.

نیوەرو زالمیکی نووستووم دی ووتم ئەم‌فیتە نووستنی چـاکە
خەوت چاتر بوو گەر لە بیداری ژینی وا بەد بی مردنی چـاکە

۱۳ـــ (چیروك) بیســـتم یەکی لە پادشایان شەویکی بە رابواردن روژکردەوە، لەوپەری مەستی‌دا ئەی‌ووت:

لەم جیهانە خوشترین کاتی نی‌یە بوم لەم دەمە
نیمە ترسی چاك‌و بەد لەم عالەمە دل بی غەمە

دەرویشیکی رووتی لەسەرمادا نووستوو ووتی:
ئەی لە ئیقبالا کە نیتـــة وینەیەك لـەم عالەمە
دل لە غەم خالی، لە عالەم، هەم لە ئیمەش بی غەمە

پادشا پێی خوش‌بوو ، پڕیاسکەیەکی هەزار دیناریی لە کونیکەوە بو شوڕکردەوە خواری ، ووتی داوێنت بگرە ئەی دەرویش . ووتی داوێن لە کوێ بێنم کراسم لەبەرا نی‌یە . پادشا بەزەیی پیاهاتەوە ، بەراتیکی بو زیاد کردو بوی نارد . دەرویش لە کاتیکی کەمدا ئەو پارەیەی خواردو بلاوی‌کردەوەو هاتەوە .

کەسی ئازادە مەردە مالی نامینی لە دەست‌و چنگ

وەکو سەبری دلی عاشق،وەکو ئاوی لە ناو بێژنگ

لە کاتیکا پادشا ئەوەی بە دلا نە ئەهات تی‌یان گەیاند . پادشـــا هاتەوەبەك ، رووی لی‌وەرگیرا لیرەدا زیرەك‌و تی‌گەیشتووان ووتوویانە لە تیژی‌و پەلاماری پادشایان خوت بپاریزە . لە کاتیکا هیممەتی گەورەی ئەوان پەیوەندی بە ئیش‌وکاری وولاتەوە بیت باری خەلکیان بو ناگیریتە شان .

| | |
|---|---|
| با حەرامی بی بەخششی پاشا | کەسی کاتی هەل نەکا تەماشا |
| هەتا جی‌وشوینی ووتەت نەبینی | قەدرت بە بی سوود بوچ ئەدورینی |

پادشا ووتی ئەم سوال‌کەرە سەرکەشە مال بە فیرودەرە ئەوەندە بەخششی بەم کاتـە کەمە براندەوە . گەنجی بەیتولمال پارووی هەژارانە نەوەك خواردنی برایانی شەیتان .

مومی کافووری بە روژی روون کە شیتی هەلی‌کا

زوو ئەبینی کاتی شەو رونی نەماوە وا چرای

یەکی لە وەزیرانی بە ئاموژگاری ووتی ئەی‌گەورە وا ریك‌ئەبینم ئـــەم جورەکەسانە ئەوەندەی بەشیان‌بکات جیاجیا بویان بڕیاربدەیت هەتاکو لـــە خەرج‌کردنا بـە فیروی نەدەن بەلام ئەوەی فەرمووت هیچی نەدەنی‌و لی‌ی توورەبوویت ئەوە ریکی رەوشتی خاوەن هیممەتان نی‌یە کە یەکی بە لوتف هیوادارکردن‌و دیسانەوە بە بی‌هەوایی رەنجاندی .

له رووی خوت دەرگای هیواکردنەوە          زور ئاسان نی‌یە لە داخستنەوە

✤ ✤ ✤

کەسی نەیدیوە تینووەکانی حیجاز          لەسەر ئاوی کە پی‌ی بلین شورە
کانی‌ی شیرین لە جی‌یە بوو گردە          لی‌ی مەل‌و مەردمان‌و میلوورە

١٤ـــ (چیروك) یەکی لە پادشایانی پیشین لەسەروکاری‌ی وولاتا سستی‌ی ئەکرد. لەگەل سەربازانیـا تیژ بوو، کە دوژمنیکی گران رووی تی‌کرد، هەموو سوپا پشتیان کردەوە.

گەنجت لە سوپا دریغ بزانی          دەس نادەنە چەك روژی مەیدانی

✤ ✤ ✤

چ بنوینی مەردی دەمی کارزار؟          کەسی دەس بەتال بی هەموو روزگار

یەکی لەوانەی ســـتەم لی‌کراو بوو لەگەل منـا دوستایەتی‌ی هـەبوو، سەرزەنشتم‌کردو ووتم لـــە گەورەی کون وەرگەران‌و حەقی بەخششی سالان لە بیربردنەوە، بـــە کەم‌گورانی پەستی‌و نشیوی‌و بی‌سوپاسی‌و حەق نەناسینە. ووتی بەخشـــەو بیانووم ببینە لەم شەرەدا، ئەسپەکەم بی جو بوو وە سەرزینەکەی لە بارمتەدا بوو. پادشایەك لەگەل سوپادا بە پارە رژدی‌بکات ناتوانری بە گیان لەگەلیا جوانمەردی بکریت.

زەر بدە سەرت بو دانی سەرواز          زەر نەدەی لەسەر چون ئەهینی واز
اذا شبع الكمي يصول بطشا          وخاوي البطن يبطش بالفـرار
تیری دلاوەر ئـــەدا پەلامار          سك برسی هەلمەت ئەبا بو فیرار

١٥ـــ (چیروك) یەکی لە وەزیرە لابراوەکان هاتە ریزی دەرویشانەوە، وە پیروزی‌ی هاوری‌یەتی‌ی ئـەوان کاری تی‌کرد، دلی رووناك‌و کو بووەوە. پادشا جاریکی‌تر دلی پی‌خوش‌کردو ئیشی پی سپارد، وەری‌نەگرت‌و ووتی تەریکی

له خەریکی باشترە .

کەسی لە کونجی عافیەت دانیشت　　　بەستی دوو دەمی بەدگوو سەگی‌هار
قاقەزی دراند ، قەلەمی شکاند　　　لـە دەم‌ودەستی بەدگو بوو رزگار

پادشـا ووتی کەوابوو خیرەدمەندیکم نیشان‌دە بو سەرەوکاریی وولات شایان‌بیت . ووتی ئەی پادشا نیشـــانەی خیرەدمەندی تـەواو ئەوەیە لەشی خوی نەخاتە ئەم جورە ئیشانەوە .

لەســـەر بالندە هوما گەورەیە　　　کە ئیسقان ئەخواو مەل نادا ئازار

لە ریوی‌یان پرسی لە چ روویەکەوە هاوری‌یەتیی شیرت گرتە ئەستو ؟ ووتی تا لـە پاشماوەی نیچیری بخوم‌و ، لە شەری دوژمنان لە پەنای شکوهی ئەوا ژیان رابویرم . ووتیان ئیستا کەوا هاتیتە سیبەری ئاگاداریی ئەوەوەو دان بە سوپاسی بەخشایشی ئـــەوا ئەنییت بوچی لی‌ی نزیکتر نایتـــەوە هەتا بتخاتە ریزی تایبەتی‌یەکانیەوەو لە کویلە راستەکانیا ژمارەت‌کات ؟ ووتی لەبەر ئەوە کە لە پەلاماری ئەمین نیم .

ئاگر پەرســـتی بسووتینی ئاگری سەدسال
گەر تی‌ی کەوتی بە ئانی ئەسووتی ئەبیتە کوی زوخال

ری ئەکەوی بو هامرازی حەزرەتی پاشا زەری دەس‌ئەکەویت‌و ری‌ئەکەویت سەری تیابروا . حەکیمان فەرموویانە ئەبی لە سروشتی رەنگاورەنگی پادشایان بە پاریز بین کە کاتی بە سەلامی ئەرەنجین‌و کاتی بە جنیوی بەراتی ئەدەن. گیراویانەتەوە کە ووتەی نەستەقی زور بو هەمرازان هونەرەو بو حەکیمان کەم‌وکووری‌یە .

قەدرو قیمەتی خوت بگرە بەردەم　　　نەستەق‌و گالتە دانی بو هەمدەم

١٦ـــ ( چیروك ) یەکی لە هاوری‌یانم سکالای روزگاری ناهەمواری هینایە لام کە ئەوە بەش بکات کەمەو مال‌و منال زور . توانای باری هەژاریم نی‌یە ، گەلی

جار به دلدادیت بگویزمەوە بو وولاتیکی‌تر هەتاله هەر شیوەیەکا ژیان بەرمه سەر کەسی ئاگای له چاکی‌و خراپیم نەبی .

زور برسی نووست‌و کەسی نەی‌ناسی

زور گیان گەیه لیو ، کەس بوی نەگریا

هەمدیسان له تانووتی دوژمن ئەترسم که له دوای من بەتەشەر پیم‌پی‌کەنن‌و کوششي من بو مال‌ومنال بخەنه سەر بی‌مروەتی‌و بلین :

مەبینـــه هەرگیز بی حەمیەتی — نەیویست ببینی رووی خوش بەختی
ریگەی ئاسانی بو خوی دوزیەوه — مال‌ومنالی جی‌هیشت له سەختی

وه له عیلمی ژماره ئەوەندە ئەزانم که ئەگەر لەبەر قەدرو حورمەتی تو ئیشیکم بدریتی ببیته هوی کوبوونەوەی دلی پەریشانم، چی له ژیانم ماوه سوپاس گوزاری‌ی توم بو تەواو ناکریت . ووتم ئەی برام ئیشي پادشا دوو سووچي هـەیه : هیوای نان‌و ترسی گیان ، جا ناریکی بریاری خیرەدمەندانه بەو هیوایه خوت بخەیته ئـەو ترسەوه .

کەس نەهاتوته مـالی دەرویشی — بو خەرجی زەوی وه یا خەرجی باغ
تو به شیواوی‌و تالی رازی بـه — یا جگەردانی له بەردەمي زاغ

ووتی ئەمـەت ریکی حالی من نەوت‌و وەلامی پرســـیاری من نەبوو . ئەی نەت‌بیستووه که ووتوویانه هەرکەس خیانەتی کرد دەستی له حسابا ئەلەرزی .

راستی‌یه ری‌ی رەزایی داری‌رەس — قەت له ری‌ی راستی نەبوو ون کەس

حەکیمان فەرموویانه چوار کەس لـه چوار کەس بەگیان رەنجان : جەردە له سولتان ، دز له پاسەوان ، فاسق لەقسه گیرەوه ، ئافرەتی خراپ له داروغه بازار . کەسی له حسابا پاکه له موحاسەبه بی‌باکه .

روو له ئیش وەرمەگیره گەر ئەتەوی — کاتی بەرزیت مەجالی دوژمنی تەنگ

پاك‌به باكت له كەس نەبی . گازر جلی پیسە كە ئەیدەنە بەرسەنگ

ووتم چیروكی ئەو ریوی‌یە ریكی حالی تویە كە دی‌یان رای‌ئەكرد ، ئەكەوت‌و هەل‌ئەسایەوە . كەسی پی‌ی‌وت چ بەلایەكە هوی ئـەم جورە ترســـەیە ؟ ووتی بیستومە حوشتر بە بیگار ئەگرن . ووتیان حوشتر كوی‌ی لە تو ئەچی‌و كویی تو لە حوشتر ئەچی ؟ ووتی بی‌دەنگ بە ئەگەر حەسوودان لە قینیـكەوە ووتیان ئەمە حوشترە كی بو رزگاریم غەمی منیەتی هەتا بە حالی منا چاوبگیرن . تا تریاق لە عیراقەوە دیت مارپیوەداو ئەمریت . تو وەكو ئەلییت فەضل‌و ئایینی لە خواترسان‌و ئەمنیەت هەیە ، بەلام حەسوودان لە بوسەدان . داوا كاران لەگوشەدا دانیشتوون . ئەگەر ئەو جەوان رەوشتی‌یەی تو پیچەوانەیان بو پادشا گیرایەوە ئەتوانی بەربەرەكانی لەگەل پادشـادا بكەیت ، وە كی ری‌ی گفتوگوی هەیە وا بە ساز ئەبینم مولـكی قەناعەت پاسەوانی بكەیت‌و واز لەسەرداری بیینی .

دەلیا یرە لە دوری سوودمەند بەبی ژمار

گەر ئارەزووت لە سەلامەتی‌یە رووكەرە كەنار

هاوریم ئەم ووتەیەی بیست‌و هاتەوە یەك‌و رووی لەم چیروكە وەرگیراو كەوتە ووتنی رەنجان ئامیز كە ئەمە چ عەقل‌و فامیكەو چ شایستەیی‌و تی‌گەیشتنیكە . ووتاری حەكیمان راست هات كە وتوویانە دوستان لە بەندیخانەدا بەكاردین‌و ، لەسەرخوان هەموو دوژمنان بەدوست ئەنوینن .

بە دوستی مەگرە كەسی لە نیعمەت لی‌ئـەدا لافی هاوری‌یی‌و یاری

ئەو كەسە دوستە دەستی دوست ئەگری لـە پەریشـانی‌و كاتی ناچاری

دیتم كە تیك‌چووەو ئاموژگاری بەقینەوە وەرئەگری . نزیك‌بوومەوە لە خاوەن دیوان ، بـە ناسیاوی‌یەكی رابوردوو كە لە نیوانمـانا هەبوو حالەتیم پی‌ووت‌و

شایستەییم تێگەیاند ، تا لە ئیشیکی پچووکدا دایانمەزراند . ئەوەندەی بەسەرا نەهات لە پاکیی سروشتو جوانیی راویژو بریاری پەسەندکرا . ئیشی لەوەتییەری ، لە پایەیەکی بەرزتر جێگیربوو هەروەها ئەستیرەی کامەرانی لەبەرزبوونەوەدابوو هەتا گەیشتە ئەوجی ئارزوو . لە حوزووری سولتاندا ئیشارەتی بو ئەکراو بوو بە پالپشت . بو سەلامەتیی حالی شادمانیم نواندو ووتم :

لە کاری بەسترابی تو مەترسە لیی دلت نەشکی
کە سەرچاوەی ژیان کەوتوتە چولیو تاریکستانی

الا لا تحزن اخا البلیة     فللرحمن الطاف خفیة
بەلادیدە مەبە دلتەنگ ، ئەزانی     لەلای رەحمان هەیە رەحمی نیهانی

لە گەردشی زەمانە مەبە ترشروو ، کە سەبر
هەرچەندە تالە خو بەري شیرین ئاخاتە دەر

لەو نزیکانە لەگەل کومەلی یاران سەفەریکمان بو ریك‌کەوت . کە لە زیارەتی مەککە هاتمەوە دوو قوناغ هات بە پیرمەوە . کە دیمەنی دەریم دی پەریشان وا لە شیوەی دەرویشانا ، بە فەراسەت زانیم لەکارخراوە . دوستانی دیوانی کاتی بەتالیی دیداری دوستانیان هەیە کە لەکاردانەمینن .

کاتی گەورەیی لەبگرەو بەردە     نیانە کاتی بو ئاشنایان
کاتی پەکیان کەوت ئەبن بە دەرویش     دەردی دل دینن بولای دوستان

حالم لیپرسی ، ووتی ئەوەی تو ووتت . کومەلی حەسوودان حەسوودییان پیبردم ، وە خەیانەتیان دایەپالم . پادشا خوا مولکی بەردەوامکا ، بو دەرکەوتنی راستی نەگەرا ، وە دوستانی دیرینم لە ووتنی راستی بیدەنگ بوونو هاورییەتیی کونیان فەراموش کرد .

ئەبینی بەرامبەر بە خاوەندی جاە     لەسەر سینە دەستو ستایش ئەلین

زەمانە ئەگەر خستی هەر ئەو کەسە    هەموو دین‌و دوو پیِ‌ی لەسەر سەر ئەنین

بە کورتی دووچاری هەموو جورە سزایەك بووم تا لەم حەفتەیەدا کە مژدەی سەلامەتی‌ی حاجی‌یان گەیشت لە بەندی‌گران رزگاریان کردم وە مولکی واریسیم‌یان دامەوە . ووتم ئەوجارە ووتاری منت وەرنەگرت کە ووتم ئیشي پادشـایان وەکو سەفەری دەلیایە بە ترس‌و بە کەلکە ، یا گەنجی ئەگری ، یا بە تەلیسمی ئەمری .

یا بە هەر دوو دەستی زەر دینیتە ناو داوینی خوی
یابە مردوویی شەپولی روژی ئەیخاتە کەنار
سوودی دەلیا باشە گەر ترسی شەپولی تیا نەبی
گول لە باخەلتا چ خوشە گەر نەبی ترست لە خار

ریکم نەدی زیاتر برینی دەروونی بە تانووت‌و تەشـەر بتاشم‌و خومی تی‌هەل‌سووم . بەم دوو شیعرە کورتم کردەوە .

بزانـە پی‌ی لە پیوەندا ئەبینی    لە پەندی مەردومان هەرکەس بە رەنجە
ئەگەر نیتـە ئیـتر توانایی ئازار    نەخەیتە ناو کونی دووپشك ، پەنجە

۱۷ ـــ ( چیروك ) چەند کەسی هاوریم بوون ، دیمـــەنی دەریان بەچاکی رازابووەوە یەکی لە پیاوە گەورەکان بەرامبەر بەم کومەلە باوەریکی جوانی گەوەری هەبوو ، وە مووچەیەکی بو دیاری کردبوون ، تا یەکی کردەوەیەکی لی دەرکەوت ریکی حالی دەرویشان نەبوو . باوەری ئەو پیـــاوە تیکچوو ، بازاری ئەمیان بی‌رەواج بوو ، ویستم لە ری‌یەکی بەجی‌وە هاوریکانم رزگار بکەم ، رویشتم بو خزمەت قاپی‌وان ، نەیان‌هیشتم وە دووریان خستمەوە . بیانوویان هەبوو چونکە ووتوویانە :

بـــەبی رابەری مەسووریرەوە    لە قاپی‌ی میرو وەزیرو سولتان
سەگ‌و قاپیەوان کە غەریبیان‌دی    ئەم یەخەی ئەگری ، ئەویتر دامان

کاتی نزیکانی ئاستانی ئەو گەورەیە بە حالی منیان زانی بە ئیکرام بردمیان‌و جی‌یەکی بەرزتریان بو دیاری‌کردم ، بەلام خوم گرت وە لەنزمتر دانیشتم‌و ووتم:

لیم‌گەرین من کویلەییکم کەمترین    با لە ریزی کویلەکان بم هەم نوشین

ووتی الله الله کەی شوینی ئەم ووتارەیە ؟

بو سەرسەرو چاو گەر تەشریف‌بینی    نازت ئەکیشین کە نازەنینی

بە کورتی دانیشتم ، وە لە هەر دەریکەوە دەستم‌کرد بەووتار تا باسی بی‌نەوایی یارانم هینایە ناوو ووتم :

چ‌تاوانیکی دی ئەو خاوەنی بەخشینی دیرینە
کە کویلەی خوی لەبەرچاوا بووە وا سووك‌و بی‌قیمەت؟
خوایی گەورەیی‌و فەرمانرەوایی بو کەسی ریکە
لە کویلەی سووچ ئەبینی‌و بەردەوامە نانی‌و نیعمەت

حاکم ئەم ووتە گەورەیەی لا پەسەند بوو ، وە فەرمانی‌دا مووچەی یاران وەکو جاران ئامادە کەنەوە ، وە مووچەی زەمانی پیشوویشیان بدەنی ، سوپاسی بەخشایشیم‌کردو زەمینی ئاستانم ماچ‌کردو ، بیانووی بی‌پەروایی‌م داواکرد ، وە لە کاتی هاتنەدەرەوەدا ووتم :

کە کەعبەبوو بە قیبلە بو نیازان
لە ریگای دوورەوە بووی‌چوون بەسەرسەر
ئەبی توانات هەبی بو چەشنی ئیمە    کە کەس بەرد ناگریتە داری بی‌بەر

١٨ـــ (چیروك) شازادەیەك سامانیکی زوری لە باوکەوە بە میرات دەس‌کەوت . قاپی بەخششی کردەوەو بانگی سەخاوەتی بلندکردەوە . بە بی دریغی بەخشش‌و نیعمەتی بەسەرسوپاو گەلدا رژاند .

له قوتوا بونی عوود نایەت بـە لووتا بـە ئاگر چەشنی عەنبەر بونی دینی
سەروکیت پیئەوی بەخشندەیی کە بلاوی تا نەکەی توو نایرووینی

یەکی لە هەمنوشینی بیراویژ ئاموژگاریی دەس پیکرد کە پادشایانی رابوردوو ئەم نیعمەتەیان بە کوشش پیکەوەناوە بو روژگاری کارسازیان داناوە ، دەست لەم جوولانەوەیە کورت کەرەوە لیقەومان لە پیشەوەیەو دوژمنان لەپشتەوە . نابی لـە پیویستیا دابمینی .

ئەگەر گەنجی بکەی دابەخشی عالەم ئەگاتە هەر کویخا دەنکە برنجی
لە هەر کەس دەنکە جویەك زیوبسینی لە بوت کومەل ئەبی هەر روژە گەنجی

شازادە لەم وتەیە رووی هینایەوەیەك ، ریکی سروشتی نەبوو ، لیی توورە بوو ووتی خوای بلند ئیمەی کردووە بە خـاوەنی ئەم وولاتە کە بیخوین و بیبەخشین ، نەوەك پاسەوانیو ئاگاداریی بکەین .

بە گەنجی پر لە چل خانوو نەما فەوتا کەوا قاروون
نەمرد نەوشیرەوان وا ناوی چاکی خوی لە دوا جیما

۱۹ ـــ ( چیروك ) ئەگیرنەوە کەوا نەوشیروانی بەداد لە راوگەیەکا نیچیریان بو ئەکرد بە کەباب ، خوی نەبوو کویلەیەکیان نارد بو دییەك هەتا خوی بهینی نەوشیرەوان ووتی خوی بە کرین بینە هەتا نەبی بە شیوەو دەستوور وە دی ویران نەبی . ووتیان لەوندە چ خراپییەك رووئەدا ؟ ووتی بنچینەی خراپی لە پیشا کەمی بوو هەرکەس شتیکی لی زیادکرد هەتا گەیشتە ئەم رادەیە .

لە باغی گەل ئەر سیوی بخوا شەهی بچووکان درەختانی بنکەن ئـەکەن
بە پینج هیلکە پادشا رەوای دی ستەم سوپایان هەزار مر لە شیش توند ئەکەن

۲۰ ـــ ( چیروك ) وەزیریکی بیهوشم بیسـت کە مالی گەلی ویرانئەکرد بو

ئەوەی گەنجینەی پادشا ئاوەدانکاتەوە ، بی‌ئاگا لەوە کە حەکیمان ووتویانە هەر کەس دلی خوای بەرزو بلند ئازاربدا بو ئەوەی دلی کەسی بینیتەدەست ، خوای بلند هەر ئەو کەسەی بەسەرا زال ئەکا تا دەماری لە روزگار بینیتەدەری .

ئاگری گر بە بخووری ناکا          ئەوە دوودی دلی غەمبار ئەیکا

ئەلین سەرکردەی گیانلەبەران شیرەو کەمترینیان گوی‌دریژە . بە بریاری هەموان گوی‌دریژی باربەر چاترە لە شیری پیاوهەلدر .

کەری بەسەزمان گەر بی تەمییزە          چونکە بار ئەبا لامان عەزیزە
گا و کەر چاترن ئەگەر بەرن‌بار          لە ئادەمزادی پیاو بدا ئازار

هاتینەوە سەر چیروکی وەزیری بیهوش پادشا سووچیکی لە رەوشتی ناپەسەندی بو دەرکەوت کیشایە ئەشکەنجەوە ، بە سزای جورجور کوشتی .

دەستت ناکەوی رەزای پادشا          رانەگری دلی بچووکەکانی
لە خواوە ئەگەر بەخشینت ئەوی          چاك بە بو خەلکی هەتا ئەتوانی

گیراویانەتەوە کە یەکی لە ستەم لی‌کراوەکانی بەلایا تیپەری ، لە قەلافەتی ووردبووەو ووتی :

وەنەبی بە هیزی بازوو ، یا پایەیەك ئەگەر بوو
بە گەزاف مالی عالەم بخووری بە بی موتالا
ئەتوانی ئیسکیکی زل لە قورگت کەی سەرەخوار
بەلام گیربوو لە ناوك ورگت ئەکا یەکالا

✤ ✤ ✤

ئەفەوتی ستەمکاری بەد روزگار          ئەمینی لە بوی لەعنەتی پایەدار

٢١ــ ( چیروك ) ئەگیرنەوە مەردوم ئازاري بەردیکی کیشا بەسەر پیاو

چاکیکا . دەرویش ئەو کاتە شوینی تولەسەندنی نەبوو ، بەردەکەی هەلگرت تا کاتی پادشا لەو سوپایی‌یە قینی هەلسا فری‌ی‌دایە زیندانەوە . دەرویش هات بەردەکەی کیشـایەوە بەسەریا . ووتی تو کی‌یت‌و ئەم بەردەت بوچ دا بە سەرما ؟ ووتی من فلانم‌و ئەمە ئەو بەردەیە فلان روژ کیشات بەسەری منا . ووتی ئەم هەموو روژانە لە کوی بوویت ؟ ووتی لە پایەکەت ئەترسام . ئیستا لە چالا توم دی ، هەلم بە تالان زانی .

| | |
|---|---|
| ناشایستەیان کە دی بەختیار | عاقلان تەسلیم‌ئەکەن ئیختیار |
| نینوکی تیژو درندەت نی‌یە | لەگەل خراپان دەس‌بازیت چی‌یە |
| لە پولا بازوو بدەی سەرپەنجە | قولی زیوینت ئەخەیتـە رەنجە |
| لی‌ی‌گەری دەستی بەستی روژگار | بە ئامانجی دوست بینیە دەر دەمار |

٢٢ـــ ( چیروك ) یەکی لە پادشایان نەخوشی‌یەکی سامناکی بوو کە دووبارەکردنەوەی ناوهینانی باش نەبوو . دەستەیەك لە حەکیمانی یونان کوبوونەوە بریاریان‌دا کە ئەم دەردە دەرمانیکی نی‌یە مەگەر زراوی ئادەمیزادیك کە چەند نیشانەیەك هەیە تیابی . پادشا فەرمانی‌دا بیدوزنەوە . کورە فەللاحیکیان بەو نیشانانەی حەکیمەکان ووتبوویان دوزی‌یەوە . باوك‌و دایکیان بانگ کرد بـە بەخشایشیکی زور خوش حالیان کردن ، وە قازی فتوای‌دا کە خوینی یەکیك لە گەل رشتن بو سەلامەتی‌ی پادشایەك رەوایە . جەللاد رووی تی‌کرد بو کوشتن . کورە سـەری بو لای ئاسمان هەلبری ، زەردە خەنەیەك گرتی . پادشـا لی‌ی پرسی کەی ئەمە جیگەی پیکەنینە ؟ ووتی نازی منالان لەسەر باوك‌و دایکەو دەعوا بو لای قازی ئەبریت‌و داوای داد‚لە پادشا ئەکریت . باوك‌و دایکم بو مالی بی‌نرخی جیهان منیان بە خوین سپاردو ، قازی فتوای بە کوشتنم‌داو پادشا کارسازی‌ی خوی لە فەوتانی منا ئەبینی . خوای بەرزو بلند نەبی پەنایەکی تر نابینم .

بیبمه لای کێ له دەست تۆ فریاد     لای خۆت له دەس خۆت داوائەکەم داد

پادشا لەم ووتارە دڵی هاتەوە یەکو ئاو لـە چاویا گەڕاو ووتی فەوتانی مـن چاکترە لە خوێنی بێگوناهێکی وا رژاندن . سەروچاوی ماچ کردو گرتیە باوەش‌و بەخشایشێکی بێ‌ئەندازەی دایە . ووتیان هەر لەو هەفتەیەدا شیفای دەس‌کەوت .

دیتە بیرم هەروەها شیعرێکی ووت     فیلەوانی بوو لە گوی دەلیایی نیل
حالی میلوورە لە ژێر پێتا وەکو     حالی تووایە لە ژێر دوو قاچی فیـل

٢٣ــ ( چیروك ) یەکێ لە کوێلەکانی عەمری لەیث رای کردبوو ، پیاوان دوای‌کەوتن هێنایانەوە . وەزیری قینی لێ‌بوو فەرمانی بە کوشتنیدا تا کوێلەکانی تر ئەم کردەوەیە رەوا نەبینن . کوێلە لەبەردەمی عەمرا سەری نایە زەوی‌و ووتی :

هەرچیم بەسەر بێ ، تۆ پەسەندی کەی لەلام رەوایە
بەرامبەر حوکمی ئەو سەردارمە نیمە دآوایە

بەلام بە هوی ئەوەوە کە پەروەردەی بەخشـایشی ئەم خـانەدانەم نامەوی لە دواروژا بە خوێنی من دووچـاربیت بفەرمو هەتا لە ریگای شەرعەوە بکوژریم . پادشـا ووتی چون ؟ ووتی لیم‌گەرین وەزیر بکوژم هەتا لـــە خوێنی ئەوا خوێنم بریژنەوە ، ئەوسا بە ناحەق نامکوژی . پادشا پیکەنین گرتی‌و ئاوری‌دایەوە بە لای وەزیراو ووتی چون، ریك ئەبینی ؟ وەزیر ووتی ئەی خاوەنی جیهان لە ری‌ی خوادا ئەم چاو بێ‌پەروایە بکە بە ساقەی گوری باوکت، ئازادی فەرموو هەتا منیشی لە بەلایەکەوە نە ئالاندووە . سووچ لـــە منەوەیە کە ووتاری حەکیمانم لەگوی نەگرتووە کە ووتوویانە :

کە تۆ چوویتە شـەر بو کولوهاویژ     سەری‌خوت شکاند ئەی نەفامی گیژ
کە تیرت هاویشت بەرامبەر دوژمن     دامەنیشە لێی ، خوتی لێ‌کە وون

٢٤ـ ( چیروك ) زەوزەن پادشا ماموستایەکی هەبوو نەفسیکی کەریم و شیوەیەکی جوانی هەبوو هەموان لە روو خزمەتیان ئەکرد . لە پاشملەیش باشیان ئەووت . وا ریکەوت کرداریکی نواند لای پادشا پەسەندنەبوو ، فەرمانی دا بـــە گرتنی ، سەرهەنگانی پادشا لەبەرئەوە بەخشایشی رابوردوویان لەبەرچاوبوو ، وە خویان بـــە بارمتەی سوپاسی ئەزانی . لە کاتی چاودیری یانا نەرمی یان نواند ، وە توورەیی و سزادانیان رەوانە دی .

گەر لەگەل دوژمن بەریکی حەزئەکەی ئەو پاشملە
عەیبی تو با هەر بلی ، تو مەدحی کە وەك هەمدەمی
خو ووتاری هەر لە دەم دیتە دەری پیاوی خراپ
گەر ووتەی تال ئارەزوو ناکەی دە شیرین کە دەمی

ئەوەی پادشا لی ی دەویست هەندیکی لە ئەستوی دامالی ، لە باتی ئەوەی مابوو لـە زیندانا مایەوە . یەکی لە پادشایانی دەوروپشت پەیامی بو نارد کە پادشایانی ئەو دەورە قەدری گەورەی وایان نەزانی و بە بی حورمەتی تەماشـایان کرد . ئەگەر بریاری شـیرینی فلان ـ خوا رزگاری کات ـ روو لە ئیمـە بیت بو ئاگاداری ی دلی هەرچی کوششی تەواوتر بیت بەجی دیت . گەورە پیاوانی ئەم وولاتە پیویستیـان هەیە بە دیداری ، وە بو وەلام چاوەنواری ئەکەن . ماموستا کە ئەمەی زانی کەوتە ترسەوە ، کوتوو پر وەلامیکی کورتی دایەوە ، ئەگەر دەرکەویت نەبیتە بەلا ، لـــە پشـــتی نامەکە نووسی و رەوانەی کردەوە . دەس وپیوەند پی یان زانی ، پادشایان تی گەیاند کە فلان کە تو بەندت کردووە لەگەل پادشایانی دەوروپشـــت کاغەزو کاغەزکاریی هەیە . پادشا هاتەوەیەك . بو دەرخستنی ئەم هەواله فەرمووی پەیامبەریان گرت و نامـەیان خویندەوە نووسرابوو باوەری جوانی گەورەپیاوان لە زانایی ئیمـە زیاترە . هـاتنی ئیمەتان قوبوول فەرمووە لـە وزەی بەندەدا نی یە لـەبەر ئەوەی

پەروەردی نیعمەتی ئەم خانەدانەم بە کەممایەیەکی گورانی دلی بی وەفایی لەگەل ئەم خاوەن نیعمەتی دیرینەم ناتوانم بکەم .

پیاوی لەسەرت هەیبی لە هەردەم کەرەمی

بیانووی بدەری گەر کردی لە عومری ستەمی

پادشا رەوشتی حەق‌ناسینی پی خوش‌بوو ، خەلاتی کردو بەخشایشی تازەی دایەوە ، عوزر خواهی‌کرد کە توم بی‌سووچو تاوان ئازارداوە ووتی ئەی خاوەنم من هیچ هەلەیەك بو خاوەنم نابینم . بەلی بریاری خوا وابوو کە بەندە تووشی ناخوشی بیم ، جا بە دەستی تو چاکترە کە بەخشایشی رابوردووت لەسەر ئەم کویلەیە هەیە ، وە بەخشایشی شایانی شانازیت هەیە . حەکیمان ووتوویانە :

کەسی پیوەدایت لی‌ی مەبە بە رەنج    پیت ناگا لەکەس حەسانەوەو رەنج

هەر لە خواوەیە دوژمنیو دوستی    دلی هەردولا کەوا بە دەستی

گەرچی دەرئەچی تیر لە کەمانا    لە خاوەن کەمان ئەبینی دانا

۲۵ـ ( چیروك ) بیستم یەکی لە پادشایانی عەرەب بە فەرمانبەرانی دیوانی ووت کە مووچەی فلان ئەوندەی هەیە دووچەندانەی کەن کە هەمیشە وا لە دەرگاو چاوەروانی فەرمانە . خزمەت گوزارەکانی‌تر بە گالتەو یاری‌کردنەوە خەریکن ، وە لە بەجی‌هینانی خزمەتا سستی ئەکەن . خاوەن دلی بیستی ، هاواری‌کرد ، وە جوشی لە دەروونیەوە هاتەدەر . لی‌یان پرسی چیت دی ؟ ووتی پایەی کویلەکان لە دەرقاپی‌ی خوادا بەم چەشنەیە .

دوو بەیان کەسی بیتە خزمەت شا    سیهەم ئەبینی لی‌ی لوطفو نیگا

بو خواپەرستی راستی‌یە هیوا    کە بی‌بەش نەبی لە خزمەت خوا

✤ ✤ ✤

بەرزی وا لە ناو فەرمان جیھینان      بیھیوابییە فەرمان وازھینان
کەسی نیشانەی راستیی تیدایـە      سەری خزمەتی لەبەر دەرگایە

٢٦ــ (چیروك) ئەگیرنەوە ستەمکاریك داری ھەژارانی ئەکری بە ستەمو بە دەولەمەندانی ئەفروشت بە کەم. پیاوچاکی بە لایا تیپەری‌و ووتی:

بوچی ماری ھەر کەسیکت دی ئەبی تو پیوەدەی؟
کونەبوویت نیشتی بە ھەر جی‌وە ئەبی ویرانی‌کەی؟

✤ ✤ ✤

لە ئیمە بروا زورت، لەلای خوا      ناروا، زانایە خوا بە پەنھـان
زورداری مەکە لە ئەھلی زەمین      دوعایان ئەچی ھەتا ئاسمان

زالم لەووتەی رەنجـاو لە ئاموژگاریی رووی ھینایەوە یــەك. ئاوری لی نەدایەوە. (واخذته العزة بالاثم) ھەتا شەویك ئاگر لە چیشتخانەوە لە ایزانەدار بەربوو، چی مولکی ھەبوو پیوە سووتـا، لە دوشەکی گەرمەوە لەسەر خولەمیشی گەرم داینا. وا ریکەوت ھـــەر ئەوپیـاوە بە لایا رابوورد کە لەگەل ھاوری‌یانا ئەی‌ووت نازانم ئەم ئاگرە لە کوی‌وە ھات بو خانووی من؟ فەرمووی لە دووکەلی دلی دەرویشانەوە.

لە ئاھی دلی دەردمەند دوورکەوە      برینی دەروون خوی نومایان ئەکا
دلی کەس مەرەنجینە گەر بوت کرا      کە ئاھی جیھـانی پەریشـان ئەکا

(ووردی) لە تاقی ھەیوانی کەیخوسرەو نووسرابوو:

تەمەنھای دریژ سالـەھایی سـال      بەسەرمانا دین ئیمە واین لە چال
وەکو دەس‌بەدەس مولکمان ھاتەدەس
ھەروا ئەچیتە دەسی گەلی کەس

٢٧ــ (چیروك) یەكیك لە زوران‌بازی‌یا هەلكەوتبوو ، سیسەدو شەست چەشنی بە نرخی ئەزانی ، هەر روژی بە جوری لەوانە زورانی‌ئەگرت . مەگەر گوشەیەكی دلی لەگەل جەمالی یەكی‌لە شاگردەكانیا مەیلی هەبوو، سیسەدو پەنجاو نوچەشنی فیركرد مەگەر چەشنیكی نەبی لە فیركردنیا خوی دوور ئەگرت‌و دوای‌ئەخست . كورە لە هیزو پیشەی زوران‌بازی‌یا هەلكەوت . لەو كاتەدا كەسی نەبوو لـە زوران‌بازی‌یا بەرانبەریی بكات تا ئەندازەیەك لای پادشای ئەوروژە ووتبووی وەستام ئەگەر لـە من زیاتر بی لە رووی گەورەیی‌و پەروەردەی منەوەیە ، ئەگینا بە هیز لـــەو كەمتر نیم ، وە بە پیشەو چەشن لەگەلیا بەرابەرم . پادشا ئەم ووتانەی لاگران‌بوو ، ووتی ئەبی زوران‌بگرن . شوینیكی فراوانیان ریك‌خست ئەنجا هاوكارانی دەولەت‌و بە روالەتەكانی دیوان‌و زورئاوەران كوكرانەوە . كور وەكو فیلی مەست هات بـــە هەلمەتی ئەگەر كیوی ئاسن بوایە لەبنی هەل‌ئەكەند ، وەستا زانی نەوجوان بە هـیز لەو زیاترە ، بەو چەشنە سەیرە كە لیی پەنهان كردبوو لەگەلیا تی‌هەلچوو . كورە نەی‌توانی ئەو فیلە لە خوی دوورخاتەوە ، هاتەوەیەك . وەستا لە زەمینی هەلگرت بە هەردوو دەست بردیە سەرسەری‌و دای‌بەزەویدا . گرمە لە خەلك هەلسا . پادشـا خەلات‌و بەخششی‌دا بە وەستاو لـە كورە توورە بوو ، وە تانووتی لی‌دا كە لەگەل یەكی كە پەروەردەی كردووی داوای بەرانبەریت‌كردو نەبشت بردەسەرە . ووتی ئەي پادشای رووی‌زەمین بە زور ئاوەری بەسەرمنا دەستی نەبوو ، بەلكە لە پیشەی زورانا ووردی‌یەك مابوو كە لە هەموو عومرا لە من دریغی‌كرد . ئەمرو بـــەو ووردی‌یە بەسەر منا زال‌بوو . وەستـا ووتی بو روژیكی وەهام ئاگاداری‌ئەكرد ، چونكـە زیرەكان ووتوویانە ئەوەندە هیز مەدە بە دوست بتوانی دوژمنـایەتیت لەگەل‌بكا . نەت‌بیستووە ئەو كەسەی لە پەروەردەكراوی خوی جەفـای دی چی‌ووتوە :

یا وەفا نەبوە خوی لە عـالەما    یا هیچ کەس نەی کردە خو لەم زەمانە
کەس نەبوو فیر بی عیلمی تیر لە من    مەر دوایی منی کرد بە نیشانە

٢٨ــ ( چیروك ) دەرویشی بە تەنیا لە گوشەی دەشتی دانیشتبوو . پادشایەك بە لایا رویشت، . دەرویش لەو شوینە کە بی خیالە لە مولکی قەناعەتا رووی بە لایا وەرنەگیرا . پادشا کە شوین هەلمەتی دەسەلاتی سولتانی یە رەنجاو ووتی ئەم هوزی خەرقەپوشانە وەکو حەیوانات وانە شایستەی ئادەمزادی نین . وەزیر هاتە نزیکیەوە پیی ووت ئەی جوانمەرد پادشای رووی زەمین بەلاتا رابوورد خزمەتت نەکردو مەرجی رەوشت و شـــیوەت بەجی نەهینا . ووتی بە پادشا بلی چاوەروانی خزمەتی کەسی بیت کە چـاوی لە بەخششیەتی ، وە ئەویش بزانی پادشایان بو پاسەوانیی گەلن ، نەوەك گەل بو گەردن کەچیی پادشایان .

پادشـا پاسـەوانی دەرویشـــە    گەرچی ئارامی وا بە دەولەتی ئەو
خزمەتی شوان نەویستراوە لە مەر    شـوان ئەگیری بکا کە خزمەتی ئەو

( پارچـــە )

گەر کەسیکت بە کامەرانی دی    یەکیکی تر لـــە کوششـا دلریش
لیی گەری چەند روژی تا ئەیخوا    خـاك میشکی سەری خەیال ئەندیش
شاهی و کویلەیی لە ناو هەلـەسی    سەرنویشتی خوا کە هـاتە پیش
گەر کەسی خاکی مردویك لادا    کەی ئەزانی غەنی بوو یا دەرویش

پادشا ووتاری دەرویشی لا پتەو بوو ، ووتی شتیك لە من داوا بکە ، ووتی ئەوەم ئەویت جاریکی تر زەحمەت بە من نەدەیت . ووتی سـا پەندیکم بدەری ووتی :

چنگی خە ئیستا نیعمەتت لا هەس    ئەم مولك و مالـە ئەروا دەس بە دەس

٢٩ــ (چیروك) یەکی لە وەزیران چووە لای ذوالنونی میسری هیممەتی لیخواست کەشەوو روژ خەریکی خزمەتی پادشاهو بەچاکەی هیوادارمو لەسزای لە ترسـام . ذوالنون گریا ، فەرمووی ئەگەر من خوای گەورەم ئەوەندە بپەرستـایە کە تو پادشا ئەپەرستی ، بیگومان لە ریزی صدیقان ئەبووم .

دەرویش هەردو پیی ئەگەیە فەلەك    نەبوایە هیوای حەسانەوەو رەنج
وەکو لـــە پادشا ، ئەبووە مەلەك    وەزیر گەر لە خوا هیند بترسایە

٣٠ــ (چیروك) پادشایەك فەرمانی کوشتنی بی گوناهیکی دا ، ووتی ئـەی پادشا بە هوی رقی لە منتە خوت ئازاری خوتت نەوی ، چونکە ئەم سزایە بـە یەك هەناسە بەسەر منەوە ئەچیتە سەر ، وە گوناهی جاویدانی لەسەر تو ئەمینی :

لە تالیو خوشی جوانیو ناشیرین روو    وەکو بای دەشتی دەورانی بەقا چوو
لە ئەستوی مایەوە لاچوو لە من زوو    ستەمکاری ئەگەر کردی ستەم لیم

پادشا ئاموژگارییی ئەوی لا پەسەندبوو ، لە کوشتنی چاوپوشی کرد .

٣١ــ (چیروك) وەزیرانی ئەنەوشیرەوان لە ئیشیکی گرنگی وولات لـــە ترسابوون ، هەریەکە بیرو باوەریکی خســـتە روو . ئەوشیرەوانیش بریاری خوی خســـتە روو . بوزەرجومەر بیروباوەری نەوشیرەوانی پەسەندکرد . بە نهیـــنی پییانووت لە بیروبریاری پادشادا چ زیادییەکتدی بەسەر بیروبریاری ئەم هەموو حەکیمانەدا ؟ ووتی بـــەهوی ئەوەوە ئەنجامی ئیش دیارنییە ، وە بیروباوەری هەموان بەستەی ئارەزووی خوایە ئایا ریكدیت یا هەلە . جاریکی بو بیرو بریاری پادشا باشترە ئەگەر ریکی راستی نەبوو بە پەیرەویی ئەو لە سزای دلنیائەبم .

لەگەل بریاری شـــادا پیچەوانـــە

ئەبی دەس شویت لە خوینو پیت نەوی ژین،

ئەگەر پادشا بە رۆژی ووت شەوە ، تو
بلی هەلهـاتووە وا مانگ‌و پەروین

٣٢ـ (چیروك) فریودەریك مووی‌سەری هونی‌یەوە کە من لە نەتەوەی عەلیم ، لەگەل کاروانی حیجازدا هاتە شاریك ووتی لە حـەج هاتوومەتەوە ، وە قەسیدەیەك شـیعری بردە لای پادشا ووتی من ووتوومە ، بەخششی‌دایەو دل‌نەوایی‌کردو حورمەتی زوری گرت . یەکی لە هاونشینانی پادشا ئەو سالە لە سەفەری دەلیا هاتبوەوە ووتی روژی جەژنی قوربان ئەمەم لە بەسرە دیوە چون بوو بە حاجی ؟ یەکیکی‌تر ووتی ئەمە باوکی لە مەلاتیە گاوربوو چون‌بوو بە نەتەوەی عەلی ؟ شیعرەکانیشیان لە دیوانی ئەنوەری‌دا دوزی‌یەوە . پادشا ووتی لی‌دەن‌و دووری‌خەنەوە ، ئەم هەموو درویەی بوچ‌کرد ؟ ووتی : ئەی خاوەنی رووی‌زەمین ووتەیەکم ماوە بیلیم لە خزمەتتا ئەگەر راست نەبوو بە هەر سزایە ئەفەرموون شایستەم . ووتی : چی‌یە ئەوە ؟ ووتی :

غەریبی ئەگەر ماستی هینا لە بوت — دوو پیوانە ئاوە لەگەل کەوچکی دو
مەرەنجە لە من گەر دروم کرد ئەلات — جیهان‌دیدە ئەیلی بە زوری درو

پادشا پیکەنین گرتی ، ووتی لەمە راستترت لە تەمەنی خوتا نەووتوە ، ووتی چی هیوایە بوی ئامادەکەن با بە خوشی بروا .

٣٣ـ (چیروك) (١) وەزیریك بەزەیی بە ژیر دەسـتانا ئەهاتەوەو بو چاکەیان تی‌ئەکوشا ، وا ری‌کەوت کە بە فەرمانی پادشا گیرا ، هەموو لا بو بەردانی کەوتنە کوشش‌و ئەوانەی سزادانی ئەمیان پی سپیرابوو ، بە نەرمی‌وجوانی لەگەلیا

(١) ئەم حیکایەتە لە دەستنووسەکەی خوالی‌خوشبووی باوکما نەبوو وا من گردم بە کوردی هیوادارم لە شیوەکەی ئەو لام‌نەدابی . (ع.م)

جوولانەوەو پیاوە گەورەکان ستایشی کرداری باشیان کرد، تا پادشا چاوی لە هەلەو سووچی پوشی ، پیاو چاکیك ئاگای لەم کارە بوو ووتی :

تا دلی دوستان بهینیتە دەست     باغی میراتیی باوکت بفروشە
وازینە مالت هەموو بسووتی     بو مەنجەلی دوست کەوا لە جوشە
بو بەدیش چاك بە ، دەمی سەگ گرتن     بە پاروویە نان ، کاری بە هوشە

۳٤ــ (چیروك) یەکی لە کورانی هارون الرشید هاتە لای باوکی بە قینەوە کە فلان سەر سوپازادە جنیوی بە دایکمداوە . هارون بە پایەکانی دەولەتی ووت سزای کەسیکیوا ئەبی چیبی؟ یەکی ئیشارەتي کرد بە کوشتنی ، وە یەکی بە زمانبرینی ، وە یەکی بە مالداگیرکردنیو دوورخستنەوەي لە وولات . هارون ووتی کورم کەرەم ئەوەیە لیی ببووریت، وە ئەگەر ناتوانی تویش جنیوی بدەیتەوە بە دایکی ئەوەندەی لە سنوور دەرنەچی ئەگینا لە پاشان ستەم لەلایەن تووە ئەبیو داوا لەلایەن دوژمنتەوە .

لەلاي ئەهلی عەقل کەی مەردە پیاوی     لەگەل فیلی دەمانا بیتە پەیکار
کەسي مەردە لە پیاوانا بە راستی     کە قینیگرت نەلی باتل لە گوفتار

۳۵ــ (چیروك) لەگەل دەستەیەك لە گەورەپیاوان لە پاپورا دانیشتبووم لە دوامانەوە بەلەمی نوقم بوو . دوو برا کەوتبوونە گیژاویکەوە . یەکی لە گەورەکان بە مەلەوانی ووت ئەم دوانە بگرەوە بە هەریەکیکیان پەنجا دینارت ئەدەمی هەتا یەکیکیانی گرتەوە ئەویان فەوتا . ووتم ماوە نەمابوو بو ژیانی بویە لە گرتنەوەي ئەویان دواکەوتی . مەلەوان پیکەنیو ووتی ئەوەی تو ووتت راستەو هویەکی هەبوو . ووتم ئەوە چیە ؟ ووتی ئارەزووی دلمن لە رزگارکردنی ئەمەیان

زورتر بوو. کاتی له بیابان ماندووبووبووم ئەمەیان لەسەر حوشترەکەی سواری کردم، وه له دەستی ئەویان قامچی‌یەکم خواردبوو له منالی‌دا . ووتم صدق الله العظیم ، خوای گەورە راستی فەرمووه ( من عمل صاحاً فلنفسه ومن اســـاء فعليها ) . یانی کەسی کردەوەی چاك بکا بو نەفسی خویەتی‌و کەسی خراپەی کرد لەسەر خویەتی.

چی ئەکەی تو دەروونی کەس مەکه ریش
چونکه لەم ری‌یه درکی زور ئەبی تووش
ئیشی دەرویشی بی‌نەوا بکه تو چونکه ئیشت ئەبی به زوری توش

٣٦ــ ( چیروك ) دوو برا بوون . یەکیکیان خزمەتی پادشـای‌ئەکرد . ئەویان له کوششی بازووی خوی ئەخوارد . جاریك دەولەمەند به دەرویشی ووت بوچی خزمەت ناکەیت هەتا له رەنجی ئیش‌کردن رزگاربییت ؟ ووتی : تو بوچی ئیش‌نـاکەیت هەتا لـــه سـووکی‌ی خزمەت‌کردن رزگاریت دەس‌کەویت ؟ هوشیاران‌ووتوویانه نانی‌جو خواردن‌و دانیشتن چاکتره له پشتینی زیرین بەستن‌و له خزمەت وەستان .

به دەست ئاسنی گەرمی پی بکەی هەویر
نەوەك دەس لەسەرسنگ‌و بەردەم ئەمیر

✤ ✤ ✤

عومری گرانم لەدەس‌چوو لەوەی هـاوین چی بخوم چی بەرکەم زستان
ئەی سکی بی‌شەرم دەنانی‌بەس‌بی دووتا نەکەی پشـت لەلای ئەمیران

٣٧ــ ( چیروك ) کەسی مژدەی برد بو نەوشیرەوانی‌بەداد ، ووتی بیستوومه که فلان دوژمنی تو خوای گەورە هەلی‌گرت . ووتی ئەی هیچ بیستووته لـه ئیمەی وازهینابی ؟

به مەرگی دوژمن نابین شادمان    کە ئیمـە دوای ئەو نابین جاویدان

٣٨ــ ( چیروك ) کومەلی لە حەکیمان لە بارەگای کیسرادا لە کارسازی‌یەك ئەدوان . بوزەر جمهر کە بچووکتریان بوو بی‌دەنگ‌بوو . پرسی‌یان لەم باسـە بوچی هیچ نادویت ؟ ووتی وەزیران بە چەشنی پزیشکانن . پزیشك دەرمـان نادا بە نەخوش نەبی . جا کە بینیم بریاری ئیوە پیکاویە ، ووتنی من لەســەری کەلکی نی‌یە .

ئەگەر ئیش بی ووتاری من بەجی‌بی    ووتاری من ئیتر لەو ئیشە ناشی
وەگەر دیم کویرو چالی وا لەلامە    ئەگەر بی‌دەنگ بیم ئەوسا حەرامە

٣٩ــ ( چیروك ) کاتی هارون الرشید ولکەی میسری دەس‌کەوت ، ووتی بە پیچەوانەی ئەو سەرکەشە کە بەسەرکەشی‌ی ووڵاتی میسر لافی خوایەتی‌ی لی‌دا ئەم ووڵاتە نابەخشم مەگەر بە کەمترینی کویلەکان . رەشیکی هەبوو ( خەسیب ) ناو بە هەرزانی ولکەی میسری‌دایە . ئەگیرنەوە کە عەقل گەیشتنی لە رادەیەکا بوو کە کومەلی‌لە خاوەن کشت‌وکاڵ شکاتیان هینایە لا کە پەموومان لە کەناری نیل چاندبوو ، بارانی ناکاو هـــات‌و پەمووی فەوتاندین . ووتی ئەبوایە خوریتان بچاندایە هەتا نەفەوتایە . خاوەندەکەی بیستی‌و ووتی :

رزق‌و مووچە بە دانش ئەر ئەبوو زور    تەنگ‌دەستی لە کوی ئەبوو ؟ لە نەفام
بە نەفامان بە جوری مووچە ئـەدا    گەلی دانای کە تیـا ئەبی سەرسـام

✤ ✤ ✤

کەی بەخت‌و دەولەت بەئیش‌زانینە    بەلکە بە هیزی ئاســمانی‌یە
کیمیاگەر ئەمری بە سەغلەت‌و رەنج    شیت لە ویرانە تووشی ئەبی گەنج
لەم جیهانەدا کەوتوون بی‌شومار    گەورەو عاقلان پەست‌و سووك‌و خوار

٤٠ــ (چیروك) یەکی لە پادشایان کەنیزەکیکی چینیی هینا . لە حالی مەستیدا ویستی لەگەلی دروست‌بی . کەنیزەك خوی نەدا بە دەســتەوە . پادشا قینی‌هەلسا ، بەحشی بە رەشیك کە لچی ژووری لە پەردەی لووتی تی‌پەریبوو ، وە لچی ژیرووی بە یەخەیا شور بووبوەوە هەیکەلی کە لە سەخری جنوکە لە شیوەی ئەسلەمی‌یەوە ، وە سەرچاوەی قەتران لە بن‌باخەلی ئەتکا .

روو ناشــیرینیت وەها ئەزانی      بو ئەو ئەوپەریەو بو یوسف جوانی

✤ ✤ ✤

دیمەن بەدیی ئەو وا نەبوو لەوا      بتوانی باسکەیت ناشیرینیی وا

بونی بن‌دەســتی هەر پەنابەخوا      وەك لاکی مردار لەبەر هەتاوا

گیراویانەتەوە کە لەو کاتەدا نەفسی‌داوای لی‌کرد وە هەوەسی بەسەریا زال‌بوو ، خوشەویستی‌ی جوولاو دەعبای هەلبری هەتا بەیانی . بەیانی پادشا کەنیزەکی‌ویست دەستی نەکەوت ، بویان‌گیرایەوە کە چی رووی‌داوە ، قینی‌هەلسا ، فەرمانی‌دا رەشەو کەنیزەك پیکەوە ببەستن‌و لەسەربانی کوشکەوە فریان‌دەنە ناو خەندەقەوە . یەکی لە وەزیرانی چاکرەوشت سەری تکاکاری‌ی نایە سەرزەمین‌و ووتی رەشی بیچـارە تاوانیکی تیانی‌یە . کویلەکانی‌تر بە لاواندنی خاوەنیانەوە راهاتبوون . ووتی ئەگەر لە ریکەوتنیا شەویکی دوابخستایە چی ئەبوو کە من زیاتر لە نرخی ئەو کەنیزەکەم پی‌ئەبەخشی . ووتی ئەی گەورە ئەوی‌فەرمووت دیارە ئەی نەت‌بیستووە کە حەکیمان لەم مەبەستەدا فەرموویانە :

تینویکی سووتاو بو ئاوی حەیات      مەزانە ترسی فیــلی دەمان بی

خانویکی چول خوانیکی تیــابی      خوانەناس باکی لـە رەمـەزان بی

پادشا ئەم ووتە ووردەی لا پەسەندهات ، ووتی ئیســتە وا رەشەم بە تو

بەخشی ، ئەی کەنیزەکەکە چی لی‌بکەم ؟ ووتی کەنیزەکەکەیش بە رەشە بیبەخشە چونکە نیوەخوری سەگ هەر شایانی سەگە .

لات پەسەند نەبی بو دوستی هەرگیز　　　کەسی رووی‌کردە شوینی ناپەسەن
تینــــویك ئاوی زولالی ناوی　　　کە پاشماوەبی لە دەمی بوگەن

٤١ــ ( چیروك ) لە ئەسکەندەری رومی‌یان پرسی وولاتی روژاواو روژەلاتت بە چی‌گرت ، خو پادشایانی پیشین گەنج‌و تەمەن‌و مولك‌و سوپایان لەمە زورتر هەبوو وا وولات گیری بویان سەری‌نەگرت . ووتی بە یاریدەی خوای بە دەسەلات‌و گەورە هەر وولاتیکم گرت گەلم تیا نەرەنجاندو شیوەو چاکەی پیشینانم بەتال‌نەکردەوەو ناوی پادشایانم نەبرد مەگەر بە چاکی .

عاقل بــــە گەورە کەسی دانانی　　　ناوی گەورەکان ناشــــیرین بیی

✤ ✤ ✤

ئـەم شــــتانە گشتی هیــچ‌و روییوە
بەخت‌و تەخت‌و ئەمرو نەهی‌و گیرودار
ناوی چــاکان تو مەفەوتینــە هەتا　　　ناوی چاکی تویش بمینی پایەدار
ناوی چاکــی لی‌بمینی ئادەمی　　　چاکە، نەك دوای‌خوی سزایی روزگار
( نوســــخە )

ووتەی سەعدی بەچی‌بینی رەوایە　　　کە کارسازی وولاتەو بیرو رایە

# بەندی دووەم : رەوشتی دەرویشان

١ــ ( چیروك ) یەکی لە گەورەکان بە خواپەرستیکی ووت چی لە فلان خواپەرست ئەلییت کە کەسانی‌تر دەربارەی بە تانووت ئەدوین . ووتی لە دیمەنی

دەرەوەیدا خراپی نابینمو دەروونیشی پەنهانئەبینم .

لەبەر هەرکەس کراسی عابیدیت دی　　به عابید سەیری کەو مەردی بەکردار
ئەگەر دیوی دەروونی پی نەزانی
به دیوی ناوی کەی بووی موحتەسیبکار(*)

۲ ــ (چیروك) دەرویشێکم دی سەری لە ئاستانی کەعبە هەڵئەسوو ، ئەینالاندو ئەیووت : ئەی لیخوشبوو بە رەحم تو ئەزانی لە ستەمکارو نەزان چیئەوەشیتەوە .

عوزری سستیم هیناوەتە خزمەت　　نەك بە طاعەت کە خوم بکەم ئیظهار
لە گوناە عاصیان ئەکەن توبە　　عاریفان بو عیبادەت ئیستیغفار

خواپەرستان پاداشی خواپەرستییان ئەویتو بازرگانان قیمەتی کوتاڵ . منی کویلە هیوام هیناوە نە خواپەرستیم هیناوەتە دەرگاتو نە بو تیجارەت هاتووم . ( اصنع بنا ما انت اهله ، ولا تفعل بنا ما نحن بأهله ) . ئەوەمان لەگەل بکە کە تو پیی شایانی ، ئەوەمان لیمەکە کە ئیمە پیی شایانین .

ئەمکوژی وە یا سووچم ئەبەخشی　　رووم لە قاپییەو ئەم ئاستانە
کویلە هیچ کانی نەیبووە فەرمان　　من هەرووەهامە چونت فەرمانە

✣ ✣ ✣

لە قاپیی کەعبە هەزاریکم دی　　ئەگریاو ئەیووت بەخوشیو بەغەم
نالیم طاعەتم لیقوبوول فەرموو　　لەسەر گوناهم راکیشە قەڵەم

۳ ــ (چیروك) عبد القادری گەیلانییان دی رەحمەتی خوای لی بی لە حەوشی بەیت رووی لەسەر وورده‌بەردەکان دائەناو ئەیووت ئەیخوایە بمبەخشە،

---

(*) موحتە سیب : زەمانی زوو ، چاودیری خراپانیان کردوە .

وە ئەگەر شایانی سزام لە قیامەت بە کویری هەلمسینە تا لە رووی‌چاکانا شەرمەزار نەبم .

روو لەسەر خاکی بی‌نەوایی ئەلیم هەر بەیانی کە سروە بایەك دی
ئەی لە یادم کە دەرنەچوویت هەرگیز هیچت لەم کویلەیە بە یادا دی

٤ـ (چیروك) دزی هاتە مالی خواپەرستی ، زور گەرا هیچی چنگ نەکەوت . دل‌تەنگ بوو ، خواپەرست لە خەو بیدار بوو ، کلیمیك کە لەسەری نوستبوولەسەر ری‌ی دزەدا داینا هەتا بی‌بەش نەبی .

بیستم مەردانی ریگای خودایی دوژمنانیشیان کە ناکەن دل‌تەنگ
کەی ئەم پایەیە بو تو سەرئەگری لەگەل دوستانیش کە تو هەتە جەنگ

خوشەویستانی دل‌رووناکان وە نەبی لە پاشملە کەم‌وکووریت بلین‌و لە روو بوت‌بمرن .

هەرکەسی هینای بوت عەیبی کەسان بی‌گومان عەیبت ئەباتە لای ئەوان
پاشملە چەشنی گورگی پیاوهەلدر روو بە روو وەك مەریکی بەستەزمان

٥ـ (چیروك) چەند کەسی لەوانەی گەردشیان‌نەکرد کوبوونەوە بو گەران‌وسەیاحەت و هاوبەشی‌ی رەنج‌و راحەت . ویستم هاوری‌یان بکەم ، ریك‌نەکەوتن لەگەلما ووتم ئەمە لە رەوشتی گەورەکانا تازە پەیدابووە کە روو لە هاوری‌یی دەرویشان وەرگیرن‌و سوودی لی‌دریغ بکەن . من لە خوما ئەوەندە هیزو سووك بەدەنی ئەبینم کە لە خزمەت مەردانا یاریکی گورج‌و گول‌بم ، نە وەك بار بەسەر دلیانەوە .

ان لم اکن راکب المواشی اسعی لکم حامل الغواشی

ئەگەر سواری وولاغ نەبم سەر زینیان بو هەل‌ئەگرم . یەکی لە ناویانا ووتی لەو

ووته‌یه که پیستت دڵته‌نگ مه‌که . له‌م روژانه‌دا دزی له شیوه‌ی ده‌رویشانا هاتبوو ، وه خوی خسته هه‌وای هاوری‌یه‌تی‌ی ئیمه .

کەسی چوزانی کی‌ی تیایه کراس نووسه‌ر ئه‌زانی لـه نامه‌دا باس

له‌بەر ئـه‌وه ده‌رویشان سه‌لامه‌تی حالیان هه‌یه‌گومانی خراپیان پی‌نه‌بردو بـه هاوری‌ی وه‌ریانگرت .

نیشانه‌ی عارفانه خه‌رقه پوشی به‌سه‌ر روویان له خه‌لکه‌و دل‌پەروشی

پیوشـه چیت ئه‌وی‌و کوشش که بو کار

له‌سـه‌ر تاج‌و له شـان ئالایی زه‌رگار

فری‌دانی هه‌وایه‌و واز له دنیا په‌رستش نه‌ك کراسی کون لـه‌به‌ریا

✤ ✤ ✤

زاهیدی نی‌یه پوشینی په‌لاس زاهیدی پاکی‌یه‌و ئاوریشم کراس

( نوسـخه )

زری‌ی ئاوریشم با بپوشی مه‌رد نیره‌موك ناشی بوی چه‌کی نه‌به‌رد

روژی هه‌تا شه‌و رویشتبووین ، له کاتی شه‌وا له سایه‌ی دیواری نووستبووین . دزی بی هیممه‌ت مه‌سینه‌ی هـاوری‌ی برد گویا بو ئاوده‌ست ئه‌چی ، به تالانه‌وه رویشت .

سه‌یره خواپه‌رست خه‌رقه‌ی کرده‌به‌ر کراسی که‌عبه‌ی کرده جلی‌که‌ر

ئه‌وه‌نده‌ی له چاوی ده‌رویشان وون بوو چووه بورجی خورجیکی دزی . که روژ رووناك بووه‌وه ئه‌و تاریك دله ئه‌ندازه‌یه‌ك ریگه روییوو . هاوری‌یانی بی‌گوناه نووستبوون به‌یان هه‌موانیان هینایه قه‌لاوه‌و خستیانه زیندانه‌وه . له‌و روژه‌وه وازم له هاوری‌ی هیناو ریگه‌ی ته‌نیاییم گرته‌به‌ر که ( الســـلامة في الوحدة والآفة بين

الاثنين) . سەلامەتی لە تەنیایی‌دایەو بەلا لە نیوانی دوانا .

لە هوزی یەکی کردی نەفامی بە گەورە بچووك نامینی حورمەت
نابینی گایەك کەوتـــە لەوەرگا تیوە ئەثالی گای دی جەمعیەت

ووتم شانازی‌و سوپاس بو خوا کە لەفەزل‌و پیروزی‌ی دەرویشان بی‌بەش نەبووم ، ئەگەرچی بە لەش لە هاوری‌یان تەنیـــا کەوتم ، بەلام بەم چیروکە کەلك وەرگر بووم‌و بو ئەوانەی وینەی منن لە هەموو تەمەنا بەکاردیت .

ئەگەر درشتی بوو لە ئەنجومەن ئەرەنجی دلی گەلی هوشمەن
ئەگەر حەوزیکت پرکرد لە گولاو سەگی تی‌کەوی پی‌ی دەبی گلاو

٦ــ (چیروك) زاهیدی میوانی پادشایەك بوو ، کە دانیشتنە سەرخواردن کەمتری لە پیویستی خوارد ، وە کە هەلسان بو نویژ زورتری لە پیشەی جارانی نویژکرد هەتا زووەگومانی چاکی‌ی پی‌بەرن .

عەرەب ئەترسم نەگەیە کەعبە ری‌یەك پیا ئەروی بو تورکستانە

کاتی هاتەوە قوناغی خوی بانگی‌کرد خوانی بوبینن هەتا شتیك بخوا ، کوریکی تی‌گەیشتوی بوو ووتی ئـەی بابە لـە ئەنجومەنی پادشا نانت نەخوارد ؟ ووتی لەبەرچاوی ئەوان هیچی‌وام نەخوارد کە بە کاربیت . ووتی سا نویژەکەشت بکیرەوە ، نویژیکی وات نەکردووە بەکاربیت .

ئەی هونەر دانەر لەسەر بەری دەست لـە بن باخەلا عەیبت داپوشی
چون بە پارەی قەلب ئەتوانی سەرکەش چشـــی بکری وە یا بفروشی

(نوسـخە)

کلیلی قاپی‌ی دوزەخ ئـەبی نویژ لەبەرچاوی خەلك تەواوبی‌و دریژ
رووی پەرستنت گەر لە خودایە گەر پشتت کەوی جوبریل رەوایە

٧ــ (چیروك) لە پیرمە کە لە منالی‌یا خواپەرست‌بووم ، شــــەو نەئەنوستم‌و شەیدای زوهدو پاریز بووم، هەتا شەویك لـــــە خزمەت باوکما رەحمەتی خوای لی‌بی دانیشتبووم‌و هەموو شەو چاوم نەنابووە سەریەك ، وە قورئانی خوشەویستم لە باوەشا . کومەلی دەورو پشتـــــمان نووستبوون . بە باوکم ووت لەم کومەلە یەکی سەری هەل‌نەبری دوو رکات نویژ بکات ، وەها نووستبوون ئەلی‌ی مردوون . ووتی ئەی گیانی باوك ئەگەر تویش بنووســــتیتایە چاکتربوو لەوەی بکەویتە ســــەرو پیستی‌خەلك .

گەزانی خوی نەبی نابینی هیچ کەس
کە پەردەی خودپەسەندی‌ی وا لەبەردەس
ئەگەر چاوی خوابینی بدەن پیت
لە خوت بی‌کارەتر نابینی هیچ‌کەس

٨ــ (چیروك) یەکی لە گەورەکان لە ئەنجومەنیکا بە شان‌و بالیائەهاتن ، وە لـە شیوەجوانەکانی زیاتریان بەیان‌ئەکرد . سەری بلندکردو ووتی من ئەوەم کە خوم ئەزانم .

کفیت أذی یا من یعد محاسني علانیتي هـذا ولم تـدر باطني

رەنج‌کیشانت بەسە ئەي کەسی کە ژمارەی جوانی‌یەکانم ئەکەیت ، ئەوە دیوی دەرەوەمەو لە دیوی ناوەوەم نازانیت .

شیوەم لە چاوی خەلکی بەلی جوانە دیمەنی
سەرشوری پیسی ناوەوە شەرمندەم‌و حـەزین
تاوس بە نەخش‌و رەنگی بە جوانی ئەزانی خەلك
خویشی چ شەرمەزارە لە دوو قاچی ناشـــیرین

٩ــ ( چیروك ) یەکی لـــە پیاوچاکانی لوبنان کە پایەی بەرزی لەناوخەلکا ناوی هەبوو ، وە بـــە کەرامەت ناوی دەرکردبوو هاتە مزگەوتی شام لەگوی ئاودەسخانە دەسی بە ئاو گەیاند کەوتە حەوزەکەوە بە رەنجیکی زور هەتا رزگاریان کرد . کاتي لە نویژ بوونەوە یەکی لە یارانی پیی ووت گریەك لە دلمایە. ووتی چیە ؟ ووتی دیتە یادم کە شیخ بەسەر دەلیای روژاوادا رویشت پیی تـەر نەبوو ئیمرو چ حالی بو کە لە بالاپیاوی ئاوا بە فەوتان هیچی وای نەمابوو ؟ شیخ ســـەری بردە باخـــەلی بیرکردنـــەوە ، دوای تیووردبوونەوەیەکی زور سەری هینـایەدەری و فەرمووی نەت بیستووە کە گەورەی عالەم صەلاتو سـەلامی خوای لەسەر فەرمووی « لي مع الله وقت لا يسعني فيه ملك مقرب ولا نبي مرسل » یانی هــــەیە بو من لـــەگەل خوادا کاتی وەها کە لەگەلما نـە فریشـــتە نزیك و نەپیغەمبەرەرەسوولەکان تیا دەرنابەن ، نەی فەرموو هەمیشە کاتی وای هەبوو جوبرەئیل و میکـائیل نەیان ئەتوانی لەگەلی رابویرن ، وە کاتی وای هەبوو لەگەل حەپسەو زەینەبەدا رای ئەبوارد « مشاهدة الابرار بين التجلي والاستتار » . یـانی دیدەنی چاکان بو خوا وا لـە نیوانی دەرکەوتن و نیهانی یا ، خوی ئەنوینی و خوی وون ئەکات .

گاە ئەگەی پاریزو ، گەە ئەنوینی تو دیداری خوشتر
ئاگری ئیمە ئەکەی تیژ هەروەکو بازاری خوت

اشاهد من اهوى بغـير وسـيلة    فيلحقني شـــأن اضل طريقـاً
يهيـج ناراً ثم يطفي برشـــه    لذاك تراني محرقاً وغريقاً

بی پیچ وپەنا یارم ئـەبینم(١)    جاجاریش چاوم ریگە نابینی

(١) ئەم دوو دیرەی سەعدی بە عەرەبی ووتویە ، لـە دەستووسەکەدا وەك خوی بوو ، هەولمدا بەم جورە یانکەم بە کوردی   (ع. م.)

تاویك دی كلبەی ئاگر خوش‌ئەكا تاویك بە خورژم ئاو ئەرژینی
نابینی كەوا ئەم ئاگرو ئاوە گا ئەخنكینی ، گا ئەمسووتینی

١٠ــ ( چیروك )

یەكی پرسی لە كور وونكردووی پیر كە ئەی رووناك سروشتی گەورەیی ژیر
لە میسرا چون‌بوو بونت‌كرد كراسی كەچی لـەو چالی كەنعانەت نەناسی
ووتی حالەت وەكو بەرقی جیهـانە گەهی پەیـدایە گاهی‌تر نیهـانە
بەرزتر تارمە گەە لی‌ی دائەنیشم كە نابینم گەهی پشت قاچی خویشم
ئەبوو ، دەرویش لەسەر حالی بمایە لە دوو عالەم دەسی خوی بەر بدایە

١١ــ ( چیروك ) لە مزگەوتی بەعلەبەك كاتی ووتاریكم ئەووت لە ریگای ئاموژگاری‌و وەعظەوە لەگەل كومەلی دل‌كوژراوی دل‌مردوو ، لە عالەمی شیوە ری بە مەعنا نەبردوو . دیتم كە نەفەسم ناگەریتەوەو ئاگرم لە داری تەریان كاریگەر نابی . پەروەردەكردنی ئیستران‌و ئاوینە راگرتنم لە گەرەكی كویران لا دریغ‌بوو. بەلام دەرگای مەعنا كرابووەوەو هەودای ووتار دریژ بوو بوو ، وە لە مەعنای ئەم ئایەتە (ونحن اقرب الیه من حبل الورید) ووتەم گەیاندبوە شوینیك كە ئەم‌ووت :

دولبەر نزیكتر لە خوم بە خومە سەیر ئەوەیە كە من لەو دوورم
چی‌بكەم لەگەلا كي ئەتوانم بلیم یارم لە باوەش ، من لی‌ی مەهجوورم

من بە شەرابی ئەم ووتارە مەست‌و زیادە پیالەم وا لە دەست ریبواریك بـــە تەنیشت ئەنجومەنەكەدا تیپەری ، دەور پاشان لەو كاری‌كرد ، زریكەیەكی وەهای‌كرد كە ئەوانی تریش ریكی ئەو كەوتنـە خروش‌و خـاوەندانی ئەنجومەن هاتنەجوش . ووتم ( سبحان الله ) دوورانی ئاگادار لـە حوزوورو نزیكانی نابینـا دوور .

تا گوی گر نەکا فامی گفتوگو      هیز لە ووتەبیژ داوا مەکە تو
مەیدانی پانی ئارەزوو دەرخە      پیاوی ووتەبیژ تا بدا لە گو

۱۲ ــ (چیروك) شەویك لە بیابانی مەککە لـــە بیخەوی‌یا پیی رویشتنم نەمابوو ، سەرم نایەوە . بە حوشترەوانم ووت دەست لەمن هەلگرە .

پی‌پیادەی هەژار ئەبی چەند بروا      حوشتر لە روین کە نەما توانای
هەتاکو قەلەو لەشی ئەبی لەر      لەر ئەبی بمری لە سەختی‌و سزای

ووتی ئەی برادەر حەرەمی مەککە لەپیشەوەیەو جـــەردە لە دواوە ، ئەگەر رویشتی بردتەوەو ، ئەگەر نوستی مردی . نەت‌بیستووە کە ووتوویانە :

لە ریگەی بادیە خوشە لە ژیر داری موغەیلان خەو
بەلام پیویستە وازبینی لە گیانی خوت ، لـە کوچی شـەو

۱۳ ــ ( چیروك ) خواپەرستیکم دی لە گوی دەلیا برینی پلنگی پیوەبوو بـە هیچ دەرمانی چاك نەئەبووەوە . کاتیکی زور پیوە دەردەداربوو ، هەمیشە سوپاسی خوای بەرزو بلندی ئەکرد . لی‌یان پرسی سوپاسی چی ئەکەیت ؟ ووتی سوپاسی ئەوە بە دەردی گرفتارم نەك بەگوناهی .

ئەگەر ئەو یارە ئازیزە بە زاری من بە کوشتن‌دا
نەلی تا لەو دەمە بو گیانی سەیری وا هەیەتی غەم
ئەلیم لەم کویلە بی‌دەستە ئەبی دەرکەوتبی سووچی
کە دل ئازوردەیە یارم هەمە هـــەر بو ئەوە ماتەم

بەلی پیاوانی‌خوا دەردیان لا لـە گوناە باشترە . نابینی کە یوسفی راست لـەو حالەدا چی ووت : «رب السجن احب الی مما یدعوننی الیـه» یانی پەروەردگارا زیندانم لا باشترە لەوەی بانگم‌ئەکەن بوی ، یانی لە زینا .

١٤ــ (چیروك) دەرویشێك پێویستیکی رووی‌دا ، کلیمێکی لــــە مالی هاوری‌یەکی دزی ، خەرجی‌کرد . حاکم فەرمووی تادەستی‌ببرن . خاوەنی کلیم تکای بو کرد کە من ئازادم کردووە . ووتی بە تکای تو خو واز لە شەرعی خوی ناهینی . ووتی ئەوەی تو ووتت وایە ، بەلام هەرکەس لە مالی وەقف دزی بکات دەس‌برینی ناوی . بی‌نەوا مالی نی‌یە ، هەرچی هەیـــە هی دەرویشانەوە وەقفی کەم‌دەستانە . حاکم دەستی لی‌هەلگرت‌و تانووتی لی‌دا کە جیهان لەسەر تو ئەوەندە تەنگ بوو هەتا دزی لــــە مالی هاوری‌یەکی وەهـا بکەیت ؟ ووتی ئەی‌گەورە نەت‌بیستووە کە ووتوویانە : مالی دوستان تالان‌کەو لە قاپی‌ی دوژمنان مەدە .

کاتی داماوی لە سەختی لەش بە داماوی مەدە

دوژمنان پیستیان گروو دوستان لەبەریان فەرووەیان

١٥ــ (چیروك) یەکی لە پادشایان بە خواپەرستیکی ووت هیچتان لە ئیمە بەیادادیت ؟ ووتی بەلی کاتی کە خوامان لەبیرېچیت .

خول‌ئەخوا هەرکەسی دەرکرد لەبەر دەرگانەیی خوی خوا

کەسی بانگ‌کانەلای‌خوی نایەلی بو لایـــەتر بروا

نعم الأمیر علی باب الفقیر بئس الفقیر علی باب الأمیر

چاکە میر لـە قاپی‌ی هەژار خراپە هەژار لـە قاپی‌ی ئەمیر

١٦ــ (چیروك) یەکی لە پیاوچاکان پادشایەکی لـە خەوا دی لە بەهەشتـا وەستاوە ، خواپەرستی لە دوزەخا . پرسی هوی بەرزیی پایـەی ئەوو هوی فەوتانی ئەم چی‌یە ؟ پیاو بە پیچەوانەی ئەم حالە خەیال‌ئەکا . دەنگی هات کە ئەم پادشـایە بە هەواخواهی‌ی دەرویشان وا لە بەهەشتاو ئەم خواپەرستە بە نزیك‌خستنەوە لـە پادشایان وا لە دوزەخا .

خەرقەوو تەزبیحو بەرگی پینەپیناوی بە تو
سوودی نابەخشی لە کرداری ریا بە ئاگەدار
نیشە پیویستی کلاوی تووکی حوشتر کەی‌لەسەر
شیوە دەرویش بەو بنیرە سەر کلاوی شەھریار

١٧ــ (چیروك) پیاویکی سەروپی رووت لەگەل کاروانی حیجاز لە کووفە هاتە دەرەوە بوو بە هاوری‌ی ئیمە. تەماشـام کرد پارەیەکی پی نەبوو، خەرامان ئەرویشت و ئەیووت.

نە لە حوشتری سوارم، نە حوشتری بە بارم
نە خاوەنی رەعیەت، نە کویلەی شەهریارم
نە غەمم نەبوونو بوونە، ئەوەندە لەم دەروونە
هەناسەیی ئەدەم من وەها ئەمەن گوزارم

حوشتر سواری پی‌ی ووت ئەی دەرویش بو کوی ئەچیت، لە سەختی‌یا ئەمریت. ئەی بیست، پی‌ی نایە بیابانو رویشت. کاتی گەیشتینە نەخلەی مەحموود دەولەمەندەکە ئاکامی گەیشتە سەر. دەرویش هاتە ژوور سەری‌و ووتی: ئیمە لـە سەختی‌یا نە مردین تو لە پوختی‌یا مردی.

پیـاوی بوو نەخوش شەوتا روژ گریا      روژ بووەوە ئـەو مرد نەخوش ماو ژیا

* * *

زور ئەسپی خوش رەو لە ری مایەوە      کەری شەل گیانی گەیاندە قوناغ
زورمان لە لەش ساغ لە خاکا وون کرد      بریندار نە مرد مایەوە لەش ساغ

١٨ــ (چیروك) پادشایەك خواپەرستیکی بانگ کرد، خواپەرست کەوتە خەیال کە دەرمانی بخوم تا لاواز بیم باوەری دەربارەم زیاتر بی. گیراویانەتەوە

که دەرمان کوشندە بوو خواردی مرد .

ئەوی لام وابوو سەغزە چەشنی بستە   وەکو پیاز یەك لەسەر یەك گشتی پیستە
که رووی خوی کردە خەلکی خواپەرستی   لە نویژا پشت لە قیبلە را ئەوەستی

* * *

کویلە گەر بانگ کا خوای خوی ئانی   ئەبی خوا نەبی بـــە کەس نەزانی

١٩ ـــ ( چیروك ) لە زەمینی یونانا لە کاروانکیان دا ، سامانیکی بی پایانیان برد . بازرگانەکان گریانو زاری‌یان زور کرد . خواو پیغەمبەریان کرد بە تکا کار کەلکی نە گرت .

که پیروزی‌ی دی دزی تاریك گیان   چ باکی هەیە لە گریەی کاروان؟
بکەی هـــاوارو بپاریتـــەوە   دز ئالتوونی خوی ناگیریتـــەوە

لوقمانی حەکیم لە کاروانەکەدا بوو ، یەکی پی‌ی ووت با ئاموژگاری‌ی ئەمانە بکەیتو وەعزیان بدەیتی ، بەلکە لە هەندی لەم مالە دەست هەل گرن . داخە ئەم هەموو سامانە بفەوتی . ووتی داخ ووتەی حیکمەتە لەگەل ئەمانەدا .

ئاسنی لەگەل مورانە خواردی   زاخاو دانەوە لی‌ی لانابا ژەنگ
لەگەل دل رەشا وەعز بی سوودە   میخی ئاسنین داناچی لەسەنگ

( پارچـــە )

روژی سەلامەت بگەرە داماوە   بو بەلا دلیان ئەبیتـــە سوپەر
داوای شتی کرد گەدا بیدەری   تا لیت نەسینن بە زورو ستەم

٢٠ ـــ ( چیروك ) ماموستای گەورەم ئەبولفەرەجی جەوزی رەحمەتی خوای لی بی ئەوەندە پی‌ی ئەفەرموم واز لـە گوی‌گرتنی ووتن بهینم ، وە فەرمانی [illegible]

بە تەنیـایی و گوشەگیری تەمەنی گەنجیم زال ئەبوو ، وە هەواو هەوەسم ئەیویست ناچار بــــە پیچەوانەی بریاری پەروەردە کەری خوم چەند هەنگاوم ئەنا وە لە تیکەلی و یستنی ووتن بەشیکم وەرئەگرت کە ئاموژگاری ی ماموستام بیر ئەکەوتەوە ئەم ووت : ( شیعر )

قازی دانیشی لە گەلمان بەرز ئەکا بو رەقص دەست

موحتەسیب گەر مەی بنوشی عوزر ئەداتە دەستی مەست

هەتا شەویك بە ئەنجومەنی گەیشتم گوینده یەکم دی ( شیعر )

رەگی گیان ئەپچرینی دەنگی هەودای تاوی ناسازی

لە دەنگی باوکە رو ناخوشترە خو دەنگ و ئاوازی

ئاوازی کە ( إن أنكر الأصوات لصوت الحمير ) لەوا هاتووە .

| | |
|---|---|
| تهاج الى صوت الاغاني لطيبها | وانت مغن لـو سكت تطيب |
| ئەچین بو دەنگی گورانی لە خوشی | کە تو گوینده بی بی دەنگی خوشە |

تاوی پەنجەی هاوری یان وا لە گوی دا ، وە تاویك وا بەســەر لیوە وە کە بی دەنگ ! ( شیعر )

لە گوی گرتنت نەی دی هیچکەس خوشی

مەگەر کاتی روین ئەوا خاموشی

| | |
|---|---|
| کە هاتە ئاواز ئەو بوربوت ژەنـە | بە خانە خوی ووت لە ری ی یەزدانا |
| ییخە گویم پەموو با گویم لی نـەبی | یا قاپی ئەوە دەرچم .لەم یانە |

بە کورتی ئاگەداری دلی هاوری یانم ریك دی و شەوم بە چەندرەنج گەیاندە روژ .

مؤذن بانگی لی هـەلدا لـەناکاو کە نەی زانیوە چەند رابوردووە شەو

دریژی‌ی شەو لە موژگانم بپرسە     لە چاوانم کە یەك دەم تی‌ی نەچوو خەو

بەیان بە ناوی پیروزی‌یەوە میزەری لە سەرم وە دیناری لە کەمەرم دەر هینـا . لەبەردەمی گویندەدا دام ناو گرتمە باوەش‌و زور سوپاسم کرد. هاوری‌یانم ئەمەیان بە پیچەوانەی خوی من ، وە بە سووکی‌ی عەقلم دی ، نیهانی پیکەنین . یەکی لە ناویانا زمانی تەشەری دریژ کردو کەوتە تانووت لیدانم کە ئەم کردەوەیە ریکی بریاری خیرەدمەندان نەبوو . خەرقەی مەشایخ بدەی بە گویندەیەکی وا کە لەهەموو تەمەنیا درەمیکی لە دەستاو حەلقەیەکی لە دەفا نەبوە ( مەسنەوی ) :

گویندەیەك دوور لـەم خانەدانا     دوو جار کەس نەی دی لە یەك دیوانا
راستی کە دەنگی لەو دەمە هەستا
مووی لەشی خەلکی راست بووەوە وەستـا
باڵندەی هەیوان لـە سـاما فری
مـەغزی وورد کردین ، قورگی خوی دری

ووتم ریك ئەوەیە زمانی تەشەر کورت کەیتەوە لـە بەر ئەوەی من کەرامەتی ئەم پیاوەم بو دەرکەوت . ووتی لە چونیەتی‌ی ئەوە ئاگادارم بکە هەتا منیش خوم نزیك کەمەوە و داوای لی‌خوش بوون بکەم بو تاوانم. ووتم بەو هویەوە ماموستای گەورەم بارەها بـــە وازهینانی گوی گرتن فرمـانی ئەدامی‌و ئاموژگاری‌ی بەرزی ئەکردم ، نە دەهـاتە گوی‌ی قوبوولم ، تا ئەستیرەی پیروزو بەختی بەرزم رابەری‌ی کردم بو ئەم شوینە ، وە لە دەست ئەمەدا تەوبەم کرد ، کەچی ژیانم ماوە تیکەل نەبم‌و گوی لە ووتن نەگرم . ( چواری ) :

لە دەم و لیوی شیرین دەنگی خوش     پەردەی بی‌و نـــەیی دل ئەفریق
بەلام عوششاق‌و نەهاوەند ، حیجـاز     لـــە گویندەی قەلب خوش نانوینی

٢١ــ ( چیروك ) بـه لوقمانیان ووت لـه کیوه ویل و ئەدەب فیربوویت ، ووتی له بی ویلانەوه ، هەرچی له وانەوه له بەر چـاوم پەسەند نەبوو ، له کردنی ئەوه پاریزم کرد .

به گالتەیش بی ئەگەر پیق بووتری لەوه پەندی وەرئەگری خاوەنی هوش
بەلام سەر پەندی حیکمەت لای نەمامان
وەکو گالتەی له گوی دی پیاوی بیهوش

٢٢ــ ( چیروك ) ئەگیرنەوه که خواپەرستی به شـــەو ده مەنی ئەخواردو خەتمیکی ئەکرد . خاوەن دلی بیستی‌و ووتی ئەگەر له تی نانی بخواردایەو بنووستایه لەوه گەورەتر ئەبوو . ( پارچه ) :

تو دەروونت به تالی خواردن که نووری عیرفان ئەبینی ئەوساکه
بویه خالی لەحیکمەتی چونکه تاکو لووتت پری لـه خوراکه

٢٣ــ (چیروك) به بەخشایشی خوا ری‌وون کردوویەك چرای ریگەی دی‌و هاته ریزی ئەهلی تەحقیقەوه ، وه لـه پیروزی‌ی دەرویشان و راســـتی‌ی نەفسی ئەوانەوه کردەوه ناپەسەندەکانی گورا بو رەوشتی جوان . دەستی له هەواو هەوەس کورت کردەوه . بەلام زمانی تانووت لی‌دەران دەربارەی دریژ بوو . له ســـەر شیوەی پیشووی باوەریان بەچاکی و واز له جیهان هینانی نه ئەکرد . ( چواری ) :

تەوانای رزگار لـــه سزای خودا به هوی تەوبەوه ئەکەویته دەس
بـــەلام ناتوانی رزگارت بی بەهیچ کولوجی لـه زمانی کەس

توانای ستەمی زمانیانی نەبوو ، دادی برده بەر پیری تەریقەت ، ووتی لـــه زمانی مەردومان لەرەنجـام . وەلامی‌دایەوه که سوپاسی ئەم بەخشایشه چون بەجی‌دینی که چاکتری لەوەی گومانت پی‌ئەبەن ؟

چەند ئەڵیت کەوا بەدینی حەسوود   لە کەم‌وکووری‌ی من نیهان ئەدوان
بو بەدخواهی‌ی من کەدائەنیشتن   بو خوین‌رشتنم کە هەل‌ئەسنە پیان
چاك‌بی‌و خراپیت بلین چاکترە   لەوەی خراپ بی‌و چاکت کەن گومان

بەلام من کە گومانی جوانی خەلك دەربارەم تەواوە ، وە من لــــە عەینی کەمی‌دام ، رەوایە بیر کەمەوەو بەخوش بکەوم . ( تاك ) :

ئەوەی کە ئەموت گەر بمکردایە   چاك رەوشت ئەبووم خواپەرستمایە
إني لمســـتتر من عين جيراني   والله يعـــلم اسراري واعلاني
لە چاوی هاوسی خوم ئەکەم پەنهان   خودا ئەزانی چیم دیارەو نیهـان

( چواری )

قاپی دائەخەم لە خوم تا کەسان   کەم‌وکووری‌ی من نەگرنە چاویان
چ سوود داخستن لە ( عالم الغیب )   زانای ئاشکرا زانا بە نیهـان

٢٤ ــ ( چیروك ) گلەییم‌بردە بەر یەکی لە مەشایخە گەورەکان کە فلان دەربارم بە خراپی شەهادەتی داوە . ووتی تو بە ووتنی چاکی شەرمەزاری‌کە .

تو چاك رەوشت بە هەتا بەدیران   بـو خراپ‌ووتن نەیانبی مەیدان
ئاهەنگی بوربوت راست بی ئیترکەی   زللەی لی‌ئەدری بە دەست گویندان

٢٥ ــ (چیروك) لە یەکی لە مشایەخی شامیان پرسی تەصەووفی راستی چی‌یە؟ ووتی لمەوبەر دەستەیەك لە جیهـانا هەبوون بە شیوە پەراگەندەو لە مەعنادا گردو کومەل . ئیستا کەسانی هەن بە دیمەن گردو بە مەعنا پەریشان‌و پەراگەندە .

( پارچە )

هـەرساتی دلت بروا بو شـوینی   با بە تەنیایش بی ســــەفا نابینی
ماڵ‌وپایەت بی‌و زەرع‌و تیجارەت   دل لەگەل خوابی گوشـــەنشینی

٢٦ـــ (چیروك) دیته یادم شەویك لە كاروانیكا هەموو شەو رویشتبووم ، لە گوی‌ی بیشەیەك نووستبووم ، عاشقی لەو سەفەرەدا هاوری‌ی ئیمە بوو لە بەرەبەیانا زریكەیەكی كردو ریگەی بیابانی گرت ، وە یەك هەنلسە ئارامی نەگرت . كە روژ بووەو پیم‌ووت ئەوە چ حالی بوو ؟ ووتی بولبولانم دی هاتبوونە نالە بەســـەر درەختانەوە ، وە كەوەكان بە كوسارەوە ، وە بەراز لە ئاوا ، جانەوەران لە بیشەدا ، كەوتمە بیركردنەوە كە مروەت نی‌یە هەموو لە تەسبیحاتا بن‌و من بـە گیژی‌و خەو كەی رەوایە ؟

| | |
|---|---|
| دوی بەمیانی مـەلی بوو ئەی‌نالاند | بردی توانام‌و عەقل‌و تاقەت‌و هوش |
| كەمیە گوی دوستی راستەقینەی من | دەنگ‌و ئاوازی من بە جوش‌و خروش |
| ووتی من باوەرم نەبوو كە وەها | دەنگی بالنـــدە تو بكا مەدهوش |
| ووتم ئەی مـەرجی ئادەمی‌زادە | مەل كە تەسبیح بخوینی من خاموش ؟ |

٢٧ـــ (چیروك) كاتی لـە سەفەری حیجازا دەستەیەك جوانانی خاوەن دل هـاوریمان‌بوون ، هاو دەم‌و هـاوهەنگاو ، كاتەها زەمزەمەیان ئەكردو شیعری ووردیان ئەخویندەوە . خواپەرستی لەو ری‌یە باوەری بە حالی دەرویشـان نەبوو ، وە ئاگای لە دەردی دلیان‌نەبوو . هەتاكەیشتینە خیلی بەنی هیلال ، منالیكی رەش لەو هوزە عەرەبە هاتەدەرەوە ئاوازیكی بەرزكردەوە كە بالندەی لە هەوا ئەهینایە خوارەوە . حوشتری عابیدم دی كەوتە هەلپەركی‌و عابیدی فری دایەخواری‌و ری‌ی بیابانی گرتەبەرو رویشت ، ووتم یاشـــیخ لە حەیوانات كاریگەربوو ، وە تو هیچ نەگورایت . (پارچە) :

| | |
|---|---|
| ئەزانی چی ووت بولبولی سەحەر | تو كەی ئادەمیت لە عشق بی‌خەبەر |
| بەشیعری عارەب حوشتر هاتەجوش | زەوقت نـەبی توی وەكو جانەوەر |

لەسەریا بێ شور ئەو حوشترە　　　ئەگەر ئادەمیزادە ئەبێ کەرە
وعند هبوب الناشرات علی الحمی　　　تمیل غصون البان لا الحجر الصلد
بە زیکریەوا لە جوشا چی ئەبینی　　　بەلام ئەم حالە خاوەن گوێ‌ئەزانی
ئەهەر بولبول لەسەرگول وا لە تەسبیح　　　لەهەر درکێ لە تەسبیحا زمانی

٢٨ــ (چیروك) یەکێ لە پادشایان تەمەنی گەیشتە دوایی، جێ‌نوشینیکی نەبوو، وەسیەتی کرد بەیانی یەکەم کەس لە قاپی‌ی شارەوە هات، تاجی شاهی بنینەسەر، وەئیشی وولاتی پێ‌بسپێرن. وا ڕی‌کەوت یەکەم کەس کە هات گەدایەك بوو کە لە هەموو تەمەنیا پارووی چنیوەتەوە، وە پینە لەسەر پینەی درووەتەوە. پایەکانی دەولەت‌و پیاوماقوولانی ئاستان وەسیەتی پادشایان بەجێ‌هیناو کلیلی قەلاو گەنجەکانیان پێ‌سپارد. هەندێ حوکمداریی‌کرد هەتا هەندێ لە فەرمانداران سەریان لە فەرمانی پیچایەوە. پاشان لە هەرلاوە کەوتنە بەربەرەکانی‌کردنی‌و سوپایان رازاندەوە. بە کورتی سوپاوگەل بەیەکاهاتن، وە هەندێ لە کەناری وولاتی لەدەس دەرچوو. دەرویش لەم لێقەومانە دلی نەخوش‌کەوت، هەتا یەکێ لە دوستانی کونی زەمانی دەرویشی لە سەفەری هاتەوە، هاوریی لەو پایەیەدا دی. ووتی سوپاس بو خوای بەرزو بلند کە بەخت یاوەریی‌کردی، وە دەولەت رابەری، هەتا گولت لە درك‌و درکت لەپێ‌دەرهات. (إن مع العسر یسرا).

(تاك):

پشکووت غونچە بوت کە لەم وشکانە　　　دار رووتە بو تو سەوزە زمانە (١)

ووتی ئەی خوشەویست سەرخوشیم لێ‌بکە کە جێی پیروزبایی نییە، ئەو کاتە

---

(١) «نوسخە» لە کاری بەستە دلت نەشکێ لێی مەترسە تو
کە ئاوی زیندەگانی لە تاریکیدایە سەرچاوەی

تو دیت غەمم هەبوو بو نانیو ئیستا بو جیهانی (چواری)

ئەگەر دنیات نەبوو وا دەردمەندی    بە خوشی ئەگەر بو دل لە بەندی
بە ئاشووبتر بەلا کوا لەم جیهانە    نەبوونو بوونی رەنجیکی گرانە

✤ ✤ ✤

گەر دەولەمەندی ئەکەی ئارەزوو    هەر قەناعەتە رەنگینت کا زوو
زەنگین بە داوین گەر بیەخشی زەر    هەتا پاداشی ئەگریتە نەزەر
زور لە گەورەم بیست توانای دەرویشان    چاتر لە خەرجی دەولەمەندەکان

✤ ✤ ✤

بارام گەر بکا گەرویشکی بوریان    نابی بە قاچی کوللە میلووران

۲۹ــ (چیروك) ئەبوو هوەریرە رەزای خوای لیبی هەموو روژی ئەچووە خزمەت محمد المصطفی سەلامی خوای لەسەر . فەرمووی ئەی ئەبوو هورەیرە (زرني غبا تزدد حبا) یانی روژە نە روژ زیارەتم بکە تا خوشەویستیت زیادبی .

بە خاوەن دلیکیان ووت روژ بەو جوانییە هەیە نەمان بیستووە کەسی حەزی لیبکاو دلداریی لەگەل بکات . ووتی لەبەرئەوەیە هەموو روژی ئەتوانن کە ببینن مەگەر لە زستانا شاراوەو خوشەویستە .

چوونە لای یاران سووکیی تیا نییە    بەلام نەك هیندە کە پیت بلین بەس
ئەگەر تو لە خوت بو بدری تانووت    بەرگویت ناکەوی کە تانووتی کەس

۳۰ــ (چیروك) یەکی لە پیاوەگەورەکان بایەکی ناریك لە سکیا پیچیدا ، توانای راگرتنی نەبوو ، بە ناچاری بەریداو ووتی ئەی دەرویشان من ئیستا وا هیچ چاریکم نەبوو ، وەگوناهیکیان لەسەر من نە نووسیو ئیسراحەتیکیش بە دەروونی من گەیشت . ئیوەش لە رووی بەخشینەوە بیانووم تەواو ببینن .

کە سك زیندانی بایە ئەي خیرەدمەند    کەسی عەقلی هەبی با چون ئەکا بەند ؟

که پیچی‌دا له سك با بیکەره دەر    که بای سك باره بو دل ئەی هونەرومر
(تـاك)
روو ترشت ئەگەر هەبوو له هاوری    گەر ویستی بروا تو لی‌ی مەگره ری

۳۱ــ (چیروك) یەکی دوستیکی هەبوو که ئیشی دیوانی ئەکرد ، کاتیکی زور چـاو پی‌کەوتنی بو ریك‌نەکەوت . یەکی پی‌ی ووت وا کون بوو که فـلانت نەدیوه ، ووتی ئامەوێ بیبینم وا ریکەوت یەکی لەخزمانی لەوی‌بوو . لی‌ی پرسی چی کردووه وا له چاوپی‌کەوتنی زویری ؟ ووتی هیچ زویرنیم ، بەلام دوســـتی دیوانی کاتی ئەتوانریت ببینریت که له ئیش‌خرا وه منیش رەحەتی‌ی خوم له رەنجی ئەوا ناویست .

کاتی گـەورەیی‌و ئیش‌و گرودار    دلیـــان بەتاله له ئاشنایان
روژی داماوی لەئیش‌لابران    دەردی دل دینن بو بەردەم یاران

۳۲ــ (چیروك) له هاوری‌یەتی‌ی یارانی شام بی‌تاقەتی‌یەکم بو پەیدابوو ، سەرم نایەوه بو بیابانی قودس ، لەگەل جانەوەران کەوتمه رابواردن هەتا هەنگاوی بووم بـــه دیلی زنجیری فەرەنگ . لـه خەندەقی تەرابلوس لەگەل جوولەکەکانا قورەکاری‌یان پی‌کردم . یەکی له سەردارانی حەلەب که ناسیاوی‌ی رابووردوومان هەبوو به لاما رابوورد ناسیمیەوه ، ووتی ئەمه چ حالیکه که هوی ئەم رەنجەیه ؟ ووتم چی‌بلیم ؟ (پارچه)

له ئینسان رام‌ئەکرد بو کیوو بو دەشت    لەگەل خوادا نەبی نەمبی خەریکی
تەماشا حالەتم ئیستا لـــه تاوله    لەگەل خەیری بەشەر بمبی خەریکی
(تـاك)
پی له زنجیر چاتره لای دوستان    نەك لەگەل بیگانه باغو بوستان

( پارچە )

لە کل خوشترە لـە چاوا شووژن بروسکەی ئاگر خەرەمان سووتانن
زنجیری فەرەنگ لە ملتا بی کوت نەك لە جیی دوستا ببیی دوشمن

بەزەیی بە حالما هاتەوە ، بە دە دینار لە زنجیری فەرەنگ کریمیەوە ، لەگەل خویا هینامیەوە بو حەلەب ، کچیکی هەبوو هینـــایە نیکاحمەوە لیی مارەکردم لەسەر سەد دینار مارەیی . کاتیکی بەسەرا رویی ، توند خووی‌و تیژروویی دەست پی‌کرد ، وە زمان دریژیی گرتەبەر ، تا رابواردنی لی تالی کردم . ( شیعر ) :

پیاو چاك لە مالیا بوو ژنی بەدخوو دوزەخ لە جیهـان بو ئـەو کەوتە روو
خوت لە جووتی بەد دوورگرە زینهار ( وقنـا ) خوا (من عذاب النـار )

هەموو جاری زمانی توانجی دریژئەکردو ئەی‌ووت تو ئەوە نیت باوکم بە دە دینـار لە زنجیری فەرەنگ رزگاری‌کردی ؟ ووتم بەلی من ئەوەم بە دە دینـار لە زنجیری فەرەنگ رزگاری‌کردم‌و بە سەد دینار بە زنجیری تو دووچاری‌کردم .

( شیعر ) :

بیستم کە جاری پیاویکی بوزورگ مەری رزگارکرد لە دەس دەمی گورگ
شەوهات‌و چەقوی لەقورگی مـالی مەر لـــە ژیر چەقو بە زار دەنالی
ئەیووت لە دەم گورگ تو دەرت‌هینام کەچی بوویتە گورگ گیانت دەرهینـام

٣٣ــ ( چیروك ) یەکی لە پادشایان لە خواپەرستیکی خاوەن منـالی پرسی کاتی خوشەویست چون رائەبویریت ؟ ووتی هەموو شەو لـە پارانەوەدا ، هەموو بەیان لە دوعای پیویستا ، وە هەموو روژ لەبەندکردنی خەرج‌کردنا . تا پادشا لە مەبەستی جوانی‌گەیشت ، فەرمانی دا چی بەش ئەکا بوی دیاری‌کەن ، هەتا باری مال‌ومنال لەسەر دلی لاچی . ( پارچە )

ئەی گروفتاری دەســـتی مال‌و منال تو لـــە ئاسوودەگی نەکەویە خەیال

غەمی ووردانو نانو بەرگو قووت          تو ئەگیریتەوە لەریی مەلەکووت
هەموو روژی وەها ئەدەم بریار          کە بە شەو بچمە خزمەتی دادار
دایەدەستم کە نویژی شەو بە خەیال          ئەکەوم : چی بخون سبەینی منال ؟

٣٤ـ ( چیروك ) یەکی لە خواپەرستانی شام لە بیشەیەکا ژیانی ئەبردە سەر ، وە بەرگی درەختانی ئەخوارد . پادشایەك بە ناوی زیارەتەوە چووە نزیکیو پیی ووت ئەگەر بە باشی ئەزانی لە شارا جییەکت بو ریك بخەم تا دل بەتال چاکتر خواپەرستیت بو بکریتو خەلکی تریش لە پیروزیی هەناسەتانەوە کەلك وەربگرنو پەیرەویی کردەوەی چاکی ئیوە بکەن . خواپەرست ئەم ووتەیەی پیخوش نەبوو ، رووی لیوەرگیرا . یەکی لە وەزیران پیی ووت ئاگاداری کردنی دلی پادشا رەوایە ، ئەگەر چەند روژی بیتە شارەوە ژیان بەریتە سەرو چونیەتیی شوینت بو دەرئەکەویت . جا ئەگەر کاتی رووناکی خوشەویستیت لە هاوریەتیی بیگانە لیل بوو ئیش بە دەست خوتە . ئەگیرنەوە کە خواپەرست هاتە شارەوە ، کوشكو باغی پادشایان پی سپارد ، شوینیکی دل گوشای گیانی چەشنی بەهەشت .

( چوارینە )

سوورەگول چەشنی کونای جوانان          سونبول بە وینەی زولفی دلداران
لە ترسی ساردیی بورجی پیریژن          وەك منال شیری دایەن نەخواردن
وافانین علیها جلنار          علقت بالشجر الاخضر نار
لقەکانی بە سەریەوە گولنار          داری سەوزە کە پیوە ئاگر دیار

پادشا کوتوپر کەنیزەکیکی بو نارد روو ماهی تابان کە ئەمە نیشانەیەتی ( شیعر ) :

پارچە مانگی بوو عابد تەفرەدەر          فریشتە وینەو تاوس بالوپەر

به چاوی خوشەویستی لـە دیو تەماشاکات

وەکو فریشتەیی کەر ڕەووبی دیتە بەرچاوان

کەسی کە پادشا ویستی ئەو کەسە ســـەراپا بەد بی بە چاك ئەنوینی

ئـەو کەسەی پادشـا فریی‌داتە لا لـە ناو کومارا کەس نای‌لاوینی

٢ـــ ( چیروك ) ئەلین گەورەیەك کویلەیەکی نایابی جوانی هەبوو ، لە ڕووی مەیل‌و خوشەویستی‌و دیانەتەوە زیاد سەیری‌ئەکرد . بە یەکی لە دوستانی خوی‌ووت دریغ ئەم غولامەی من لەگەل ئەم جوانی‌یەی هەیەتی زمان‌دریژو بی‌ئەدەب نەبوایە چەند خوش‌ئەبوو . ووتی برام کاتی دانت بە دوستی‌یا نا تەمات بە خزمەتی نەبی ، چونکە عاشق‌و مەعشووقی کە هاتە ناو خاوەندی‌و کویلەیی هەل‌ئەسی . ( پارچە ) :

گەورە بو کویلەی پەری ڕوخساری کە کەوتە گەمەو یاری‌و پیکـەنین

چەند سەیرە کویلە فەرمان ڕەوابی گەورە ڕابگری نازیکـی بـەتین

( تاك ) :

کویلە هەل‌ئەگری ئاوو خشت بینی کویلە نازدار بی مشـــت ئەوەشینی

٣ـــ ( چیروك ) خواپەرستیکم‌دی بە خوشەویستی‌ی کەسی دووچار بووبوو ، نە تینی تواناو نە توانای گفتوگوی مابوو . چی تانووتی لی‌ئەدرا سوزی زیادئەبوو ، وازی لە منالی نە ئەهیناو ئەیووت ( پارچە ) :

لە داوینی تو کورت ناکەم دەستم ئەگەر لیم بدەیت بە تیغی لوران

لە دوای تو نیمە سایەو پەنایەك هەر بو لای تویە بیم گوریزان

کەوتمە تانووت لی‌دانی . پیم‌ووت عەقلی بـــە نرخت چی لی‌هات کە نەفسی پیست بە سەرا زال‌بوو ؟ زەمانی بە بیرکردنەوەدا ڕوچوو . ووتی :

کە سولتانی عەشق ڕووی‌کردە شوینی نامیـــنی هیزی بازوو بو تەقوا

چون ئەو بیچارە داوین پاك ئەبی      تـا یەخەی لـە قور کە چەقیوە وا

٤ـــ (چیروك) یەکی دلی لە دەست چووبوو، وە وازی لەگیان هینـابوو، هیوای کەوتبوە ترس‌و گومانی لەسەر فەوتان‌بوو . نە پارویەك بوو خەیالی بکریت بکەویتە دەم‌و، مەلی‌بوو بکەویتە داو .

(تاك) :

زیر ئەگەر لەلای دولەمەر نەنوینی      زیرو خاك ئیـــتر یەکسان ئەنوینی

جاریك بە ئاموژگاری پی‌یان ووت لەم خەیالە مەحالە بی جی‌یە خوت بپاریزە .

زور بەم هەوەسەی تو هەتە ویل‌و قاچی دلیان لە زنجیرایە . نالاندی‌و ووتی :

(پارچە)

بلی پـــەندم نەدەن ئیتر یاران      چاو لە مەیلی ئـەوم لە ناو جانان

شەرفروشان بـە زوری پەنجەوشـان      ئەکوژن دوژمن‌و نیگار دوستـان

(تاك) :

دوژمن زامی دانی بەدتر ئـــەبی      کە لە چاوی کەسان وەکو دوست بی

مەرجی خوشەویستی ئەوە نی‌یە لە ترسی گیان دل لە جانان گرتنەوە : (پارچە)

تو کە خەریکی خزمەتی تـەنی      عەشـــقبازیـــکی زور دروزنی

گەر. بوت ریك‌نەکەوت ری بە یار بردن

خو مەرجی عەشقە لە داوا مردن

(تاك)

ئەگەر بوی دەست‌دام داوینی ئەگرم      گەر دەستی نەدا لە دەرگای ئەمرم

خزم‌و خویشی کە چاویان بە کاری ئەکەوت بەزەیی‌یان بە روزگاریا ئەهاتەوە، پەندیان دا ئەدا ، زنجیریان بو دائەنا بی‌سوود بوو (شیعر) :

تالی‌شالی‌دا لەبو دەردم تـەبیب      نەفسی چاوچووی من شەکر داوائەکا

( شیعر )

بستت دولبەری ئەیووت نیهانی     بە دل لە دەست چوو ئەبی بزانی
هەتا قەدری خوت وەها لەلای بی     لەبەرچاوی تو قەدری من نابی

ئەگیرنەوە کە ئەو شازادەیەی ئەو چاوی لیوەبوو ئاگاداریان کرد کە جوانی هەمیشە لەم سەرمەیدانەبە سروشتیکی خوش‌و ووتاری شیرین‌و وردی‌هەیە ، ووتەی نەستەقی نەبیستراوی لی‌ئەبیستری . وا دەرئەکەوی شوری لەسەریاو سووزی لەجگەریایە ، شیوەی شەیدا ئەنوینی . کور زانی کە دل هەلاوەسراوی ئەوەو بە دەوری بەلادا ئەسووریتەوە . هات بو لای کە دیتی وا شازادە بو لای نزیك‌بووەو بو هاتنە لای سوورە . گریاو ووتی :

ئەوەی کوشتوومی وا هاتووتە لام     دلی بو کوشتەی سووتاوە گویا

هەرچەندە لوتفی لەگەل کردو لی‌ی‌پرسی چونی‌و لە کوی‌وەیت‌و ناوت چی‌یەو چ‌پیشەیەك ئەزانی ؟ جوان بە جوری نوقمی قوولایی دەلیای خوشەویستی بووبوو جی‌ی هەناسەی نەمابوو .

لەبەر بخوینی حەوت سوبعی‌قورئان     تیك‌چوویت ئەلف‌ویت لا نابی رەوان

ووتی بوچی لەگەلم نادویت ، منیش لە ریزی دەرویشانم ، بەلکە ئەلقە لە گوی‌ی ئەوانم . لەو کاتەدا بە هیزی رابواردنی خوشەویستی‌یەوە لەناو گیژاوی شەپولی خوشەویستی‌یا سەری دەرهیناو ووتی : (شیعر )

عەجەبە لەگەل وجوودت کە وجوودی من بمینی
عەجەبە کە بیتە گوفتار لای من ووتن بمینی

ئەمەی‌ووت‌و زیرەیەکی کردو گیانی بەحەق سپارد ( شیعر ) :

هیچ عەجەب نی‌یە کوژراوی لە دەر خەیمەیی دوست
ئەوە سەیرە بە سەلامەت کە بەریتە دەری گیان

٥ــ (چیروك) یەكی لە قوتابی‌یان جوانی‌یەكی تەواوی هەبوو ، وە شیوەو ووتاریكی‌ریك . ماموستا بە هەستی ئادەمزادی لەگەل جوان پیستی‌یا مامەلەیەكی هەبوو ، وە تووڕەیی‌و هەرەشەیەك كە بەسەر منالەكانی ترا هەیبوو بو ئەمی رەوا نە ئەدی‌و كاتی بە تەنیا دەسی‌نەكەوت ئەیووت (پارچە) :

| | |
|---|---|
| نەك هیند خەریكم ئەی بەهەشتی‌روو | لە دلا مابی هەتا خوم لە بیر |
| نیمە لـە سەیرت توانای چاوپوشین | تا بـە رابـەری خوم ببینم تـیر |

جاریك كورە پی‌ی‌ووت ئەوەندی لـە شیوەی دەرسا چاوت لە منــە ، وە هەروەها لە خویشم ووردئەبیتەوە . ئەگەر لە ئەخلاق‌و رەوشتی منا ناپەسەندی‌یەكت دی بەسەریا ئاگادارم بكە . هەتـا بو گورینی كوشش بكەم . ووتی ئەی كور ئەم ووتەیە لە كەسیكی‌تر بپرسە من بەو چـاوەی لەگەل تودا هەمە هونەر نـەبی هیچی تری لە تودا پی‌نابینم . (پارچە) :

| | |
|---|---|
| با چاوی بـەدبین هەل‌كوكرابی | هونەری بـە عەیب بیتە بەر نەزەر |
| لەگەل یەك هونەر بی هەفتـا عەیب | دوستت نابیـنی مەگەر یەك‌هونەر |

٦ــ (چیروك) لە یادمە شەویك یاری خوشـــەویست لە دەرگاوە هات . وەها بە بی‌خودی هەلسام لە جی‌ی خوم چراكەم بە داوینی خوم كوژاندەوە .
(شیعر) :

| | |
|---|---|
| سری طیف من یجلو بطلعته الدجی | فقلت لـه أهلاً وسهلاً ومرحبا |

دانیشت‌و گلەیی دەست‌پی‌كرد كە لە حالەتیكا منت‌دی چرات كوژاندەوە ، بە مەعنایەك . ووتم بە دوو مەعنا ، یەك وامزانی روژهەلات ، دووەم ئەم شیعرەم بە یاداهات :

| | |
|---|---|
| گەر ئیسك قورسی هاتـە لای چرا | هەلسی‌و لـە كومەل تو دەری بیق |

ومر دمم به خه‌نده‌و شیرین لیوی بوو    فوو لـه چراکه‌و بگره داوینی

٧ـ (چیروك) پیاویك زه‌مانی بوو دوستیکی نه‌دیبوو لی‌ی‌پرسی له کوی‌ـ بوویت ، زورم بیر ئه‌کردیت ؟ ووتی بیرکردن چاتره له بیزاری . (چواری) :

دره‌نگ هاتویت ئه‌ی‌یاری سه‌رمه‌ست    ئیـتر داوینت به‌رنادەم لـه ده‌ست
خوشـه‌ویستی خوت بینی دیر ـ دیر    چاتره له‌وه‌ی که لی‌ی بی تیر

ووته‌ی وورد : دولبه‌ری له‌گه‌ل هاوری‌یانا هاتی بو ره‌نجاندن هاتووه چونکه له حه‌سه‌دو به‌ربه‌ره‌كانی خالی نی‌یه .

اذا جئتني في رفقـــة لتزورني    وان جئت في صلح فأنت محارب
له‌گه‌ل هاوری‌یان بیتـه لام ئه‌گه‌ر    با به ریککیش بی هاتوویت بو شه‌ر

(تاك) :

به یه‌ك هه‌ناسه که تیکه‌ل‌بوو یار به بی‌گانه
فره‌ی نه‌مابوو که بمرم له غیره‌ت ئه‌و ئانه
به پیکه‌نین ووتی (سه‌عدی) چرای ئه‌نجومه‌نم
له‌وه‌م چی خوی که بسووتی به شوعله په‌روانه

٨ـــ (چیروك) له یادمه له روژانی پیشـینا من و دوستی وه‌کوو دووده‌نك بادام له پیستیکا بووین . وا ریکه‌وت وون‌بوونی پـه‌یدابوو . دوای زه‌مانی ککه هـاته‌وه ده‌ستی‌کرد به گله‌یی که لەم کاته‌دا هیچ ته‌ته‌ریکت نه‌نارد . ووتم دریغم لی‌هات چاوی ته‌ته‌ر به جه‌مالت روشن بی‌و من بی‌به‌ش‌بم (پارچه)

یلی به یاری دیرینه‌م ککه‌وا    ته‌وبه‌م دانه‌دا بـه زوری زمـان
بو من لام‌وایه که ته‌وبه نابی    هه‌تا به زوری شمشیری بووران
حه‌ساده‌تم برد یه‌ککی بنـیرم    که ته‌ماشاکا له جه‌مالی جوان

دووبارەی ئەلیم کە ئەی یاری من هیچ کەس تیر نابی لە سەیری رووتان

۹ــ (چیروك) زانایەکمدی بە کەسی دووچـار بووبوو ، رازی لـە پەردە دەرچووبوو بو ناو کومەل . جەفایەکی زوری لەسەربوو ئەیگرتە شان . جاریك بە ووردی پیم‌ووت ئەزانم کە تو لـە خوشەویستی‌ی ئەم دولبـەرە هەوایەکی نەفسیت نی‌یە ، وە لەم خوشەویستی‌یەدا هەلخلیسکانت نی‌یە . جا لەگەل ئەم مانایەدا شـایانی پایەی زانایان نی‌یە خویان بەدناو بکەن‌و جەفای بی‌ئەدەبان بکیشن . ووتی ئەی یار دەستی گلەیی لە داوینم بـــەردە کە زورجار بو ئەم کارەسـازی‌یەی خوم بو خوم کەوتوومەتە یادەوە . توانام بو جەفای ئەو لەلا ئاسانترە لە چاو پی‌نەکەوتنی ئەو . حەکیمان فەرموویانە دل‌دانان بو ماندووبی ئاسانترە لە چاوگرتنی بو تەماشا .

کەسی دلی دا بە دەس دولبەری جلەوی دایە بو هەر جی‌ی بەری
گەر ئاسك پی‌ی بی پی‌ی لە پەتایە ناتوانی بو خوی بچی بو لایـە
کەسی بەبی ئەو کات نەبیتە سـەر ئەگەر جەفای بوو بیخەرە سەرسەر
روژی لە دەستی گەر ووتم هاوار چەند روژ دوای ئەوە مردم ئیستیغفار
دوست هاوار ناکا لە دەستی دوستی دلی خوم دانا بو هەرچی ویسـتی
بە لوتف بو لای بانگ‌ئەکەم ئەگەم یا بەقینـەوە دەرم کـاتە دەر

۱۰ــ (چیروك) لە سەرەتای جوانیما کە ئەیزانی چونە ، لەگەل دولبەریکا خەیال‌و رازیکم هەبوو . لـەبەر ئەوەی قورگیکی خوش‌دەنگ‌و سروشتیکی وەك مانگی چواردەی هەبوو لە تاریکی‌ی شەوا . (تاك)

سەوزەی کەناری روومەتی ئەخواتەوە ئاوی حەیات
لـە شەکری ئەو سەیربکا ویستی کەسی بخوا نەبات

وا ریکەوت جوولانەوەیەکی ناریکی سروشتیم لی‌دی پەسەندم‌نەکرد . داوینم

لی‌کیشایه‌وه‌و خوشه‌ویستیم پیچایه‌وه‌و ووتم :

بڕو بیکه هه‌رچی ئه‌که‌ی ئاره‌زوو
حه‌زی ئیمه ناکه‌یت له خوت حه‌زکه زوو

گویم لی‌بوو ئه‌رویشت‌و ئه‌ی‌ووت : ( تاك )

هاوده‌می‌ی روژی نه‌ویت شه‌مشه‌مه شه‌وقی بازاری روژی پی ناشکی

ئه‌وه‌ی ووت‌و رویشت بو سه‌فه‌ر . په‌ریشانی‌ی له من کاری‌کرد : ( شیعر )

فقدت زمان الوصل والمرء جاهل بقدر لذيذ العيش قبل المصائب

وونم‌کرد کاتی وه‌سل ئینسـان نه‌زانـه
بـه قه‌دری خوشی‌ی ژین پیش کاتی قه‌ومـان

( تاك )

یه‌روو بمکوژه لـه‌لای تو مردن نه‌وه‌ك بـه بی تو ژین به‌سه‌ربردن

به‌لام بـــه هوی سوپاس‌و شانازی‌ی خواوه دوای کاتیك هاته‌وه . ئه‌و قورگی داوودی‌یه‌ی تیکچوو بوو ، وه ئه‌و جوانی یوسفی‌یه‌ی زیانی هینـــابوو . سیوی چه‌ناگه‌ی وه‌کو هیندوانه توزی لی‌نیشتبوو ، ره‌ونه‌قی بازاری جوانی‌ی شکابوو . هیواداربوو له باوه‌شی‌گرم ، خستمه ته‌نیشته‌وه‌و ووتم : ( پارچه )

روژی که هه‌تبوو خه‌تی دولبه‌ری له خاوه‌ن عه‌قل عه‌قلت ئه‌فران
ئیمرو هایتـــه‌وه ئاشتی‌که‌یتـه‌وه له‌سه‌ر روو سه‌روبورت دانیشـان

( هونراوه )

تازه به‌هارت زه‌رد بـوو بی‌هیوا ئاگری ئیمه‌یش سارد بووه‌وه ئه‌وا
چه‌ند ئه‌که‌ی ده‌عیه‌و ئه‌که‌ی له‌نجه‌ولار بیر ئه‌که‌یتـه‌وه لـه ده‌وله‌تی پار
بـرو لای که‌سی که کریارته ناز لای که‌سی‌که داواکارتـــه

( پارچە )

ووتراوە سەوزە لە باغا خوشە ،   کەسی ئەیزانی و بەم واتە ئەدوی
یانی لەسەر رووی جوانان خەتی سەوز   دلی عاشقان زورتری ئەوی
بەلام باغی تو گەندە زاریکە   هەلت‌کەندوە زوو هەم دبسان ئەروی

( پارچە )

سەبرت‌بی بو مووی بناگوي یا نەبی   دەولەتی روژانی جوانی دیتەسەر
دەستی گیانم گەر ئەبوو وەك تو بە ریش
تا قیامەت نەم‌ئەهیشت خو بیتەدەر

( پارچە )

ووتم پرسە جەمالت چ‌بوو ئەبینی وەك
لە دەوری مانگ کە میلوورە گردو پر چوشە
وەلامی دامی چوزانم کەچی لە روم رووی‌دا
مەگەر لە ماتەمی جوانیمە وا کە رەش‌پوشە

۱۱ــ ( چیروك ) پرسیم لە یەکی لە « موستەعریبان »(۱) : ما القول في المردان ؟ چی ئەلییت لە بابەتی لووسانەوە ؟ ووتی : لا خیر فیهم ، چاکی‌یان تیا نیە . ( مادام احدهم لطیفاً یتخاشن ) هەتا یەکیکیان نەرمە زبری ئەنوینی . ( فاذا خشن یتلاطف ) جا کە زبر بوو نەرمی ئەنوینی .

لووس هەتا کاتی جوانەو شیرین‌روو   ووتاری تالە ، بو خویشی تونخوو
لەگەل ریشی‌هات کەوتە بەلاغەت(۲)   تیکەلی ئەوی‌و مەیل‌و موحەبەت

۱۲ــ ( چیروك ) یەکی لە زانایەکی پرسی کەسی لەگەل مانگ روویەکا لە

(۱) موستەعریب : بە کەسی ئەلین ئەسل عەرەب نیەو بووە بە عەرەب .
(۲) لە نوسخەیەکدا : کە بوو بە لەعنەت .

ژووریکی تەنیاییدا دانیشـــت ، دەرگا داخرو چاودیران نووســـتوو . نەفس داوائەکات و هەوەس زال ، وەکوو عەرەب ئەلیت : خورما گەیشتووەو باخەوان بەرهەلستی ناکات . هیچ ئەبی بە هیزی پاریزگاری کە بە سەلامەت بمینی ؟ ووتی ئەگەر لە مانگ روویان بە سەلامەت بمینی ، لە بەدگویان بی تەشەر نابی ( شیعر )

لئن سلم الانسـان من سـوء نفسه فمن سـوء ظن المدعي ليس يسلم

لە پیسی‌ی نەفسی خوی پیاوبوو سەلامەت

لـە پیسی‌ی زەنی بەدگو نـابي رزگار

( تاك )

ئـەتوانی ئیشی خوت وازلی‌بینی ناتوانی دەمی خەلکی ببەســـتی

١٣ــ ( چیروك ) تووتی‌یەکیان لـەگەل قەل کردبوە قەفەسەوە ، لـە پیسی‌ی سەیرکردنی لـە رەنجابوو ، ئەیووت ئەمە چ‌سروشتیکی بیزلی‌کراوەو چ‌دیمەنیکی مەلعوون‌و ئەندامیکی ناریکە ، ئەی قەلی‌رەشی‌دوور . کاشکی نیوانی من‌و تو نیوانی روژهەلات‌و روژاوا بوایە . ( پارچە )

بەری بەیانی کەسی رووبەرووت کە هەلسی لە خەو

بەیانی روژی سـەلامەت ئەبی لە راستی بـە شەو . .

ئیسك‌گرانی وەکوو خوت لەگەل خوتا دانی

بـەلا کەسی وەکوو تو لـەم جیهانەدا کوانی ؟

سەیرتر ئەوەیە قەلەرەشیش لە هاوسی‌یەتی‌ی تووتی هاتبوە گیان ، (لا حول ولا) ی ئەکرد ، لە گەردشی دەوران ئەی‌نالان ، دەسەکانی وەکو زیان دیدە بە یەکا ئەهانی کە ئەمە چ‌بەختیکی سەرووژیرو چ ئەستیرەیەکی نزم‌و روژانی رەنگاورەنگە. شـایانی قەدرو پایەی من ئەوە بوو لەگەل قەلی لەسەر دیواری باخی بـە لەنجەولار

بروبشتمایه ( تاك )

بەسە بو خواپەرست ئەوەن زیندان که بچیته تەویلەیی رەندان

چ تاوانیکم کردووه که روژگارم بە سزا خستمیه هەودای هاوری‌یەتی شتیکی خوپەسەندی نارەسەنی زور بلی لەم بەندیخانەیەدا دوچاری‌کردم ( پارچه )

کەسی نایەتە بن‌پایەیی دیوار که وینەت بکا تیا نەخش‌و نیگار

گەر تو لە بەهەشت جیگەت دەس‌کەوی

خەلکی‌کە دوزەخ ئەکەن ئیختیار

ئەم ووتەی پیشینانم بو ئەوە ووت هەتا بزانی ئەوەندەی دانا لە نادان بیزارە، نادانیش ئەوەندە لە دانا ئەسلەمیتەوە . ( پارچه )

زاهیدی کەوتە کومەلی رەندان ووتی لـەو ناوە دولبەری بەلخی

ترش‌روو دامەنیشـــە بیـــزاری تویش لە ناو ئیمە تفتی‌و تەلخی

( چواری )

کومەلی تیکەل وەك گول‌و لاولاو تو وەك داری‌وشـك لـە ناویان رواو

چەشنی بای ناریك ، وەك سەرمای ناخوش

وەك بەفری‌کەوتوو ، سەهولی بەسـتراو

١٤ــ ( چیروك ) هاوری‌یەکم هەبوو کە سالەها پیکەوە سەفەرمان کردبوو ، وە نان‌ونمەکی یەکمان خواردبوو ، وە حوقووقی هاوری‌یەتی بی‌پایانمان هـەبوو ، دوایی بە هوی قازانجیکی کەمەوە ئازاری دلی بەرەوا دیم‌و دوستایەتی‌ی کرد بـە سوپەر . لەگەل ئەم هەموە لە هەردوولاوە دلمان پیکەوە بەستراوی‌ی هەبوو ، لەبەر ئەوە بیستبووی روژی لە ئەنجومەنیکا دوو شیعری ووتبووم . ( پارچه )

بە خەندەی سویر خوی بی لە دەر نیگار زیاتر خوی ئەکا بە زامی زامدار

گەر سەري زولفی خوش بوم دەس‌کەوی
چەشنی داوینی سەخی بو هەژار (1)

دەستەیەك لە دوستان بە جوانی‌ی ئەم وتەیە ئەوەك بە جوانی‌ی رەوشتی من شاهیدی‌یان دابوو ، وە ئافەرین‌یان کردبوو . ئەو دوستەیش لە ناو ئەوانا ستایشی زیادی کردبوو ، وە لەسەر فەوتانی هاوری‌یەتی‌ی دیرین داخی‌خواردبوو ، وەدانی نابوو بە هەلەی خویا . دەرکەوت کە لە لای ئەویشەوە ئارەزوو هەیە . ئەم شیعرانەم بو ناردو ری‌کەوتم : ( پارچە )

| | |
|---|---|
| نەبوو لە جیهان پەیمان‌و وەفا | لامان واکردت بەد عەهدی‌و جەفا |
| یەکجار لە جیهان دلم پی‌بەستی | نەمزانی وا زوو پەیمان شکستی |
| پی‌ی ئەگەر سەودای ریکیت لا چاکە | خوشەویست‌تری لە لام لەوساکە |

١٥ ــ ( چیروك ) پیاوی ژنیکی خاوەن‌جەمالی رویشت . دایکی ژنە پەرپووت بووبوو بە هوی مارەیی‌یەوە لە مالا مایەوە لە هاودەمی چارەی نەئەدی هەتا کومەلی لە هاوری‌یانی هاتن بو پرسینی حالی . یەکی وتی چونی لە دووری‌ی ئەو یارە شیرینە ؟ وتی نەبینینی ژن ئەوەندە گران نی‌یە وەك بینینی دایکی‌ژن « خەسوو » . ( تاك ) :

گول بە تالان رویی ، ماوە درك‌وخار خەزنەیان هەلگرت‌و ما لەوجی‌یە مار

( چواری )

| | |
|---|---|
| چاوی خوت لەسەر نووکی رم‌دیتن | خوشترە لەوەی ببینی دوژمن |
| پیویستە هەزار دوست واز لی بینی | نەوەك رووی یەکی دوژمن ببینی |

---

(1) ئەم شیعراندی سەعەدی لە ( رسالەی ساحیبی‌یە ) دایە . بروانە : کلیات ، چالی م. فروغی ل ٧٦٥ . (ع.م)

١٦ـ (چیروك) دیتەیادم لە روژانی جوانیما هاتوچووم هەبوو بو شوینیو، تەماشام هەبوو بو مانگك روویی . لـە تەمووزیکا کە بای گەرمی شەوی ئاوی‌دەمی وشك‌ئەکردەوەو بای گەرمی روژی موخی لە ئیسـقانا ئەهینـایە جوش بە هوی بی‌هیزیی ئادەمزادی‌یەوە، وە توانای گەرمیی دووریم نەبوو، پەنام‌ردە بـەر سـیبەری دیواری، چاوەروان‌بووم کەسی گەرمای تەمووزم بە ئاویکی سـارد بنیشینیتەوە. ناکاو لە تاریکیی دالانی ئەو خانووەوە رووناکی‌یەك بریسکایەوە یانی جەمالی کە زمانی فەساحەت‌و رەوانی لە بەیانی جوانی‌یا بی‌دەسەلاتە، وەکـو لـە شەویکی تاریکا بەیان دەرکەویت، یا لە تاریکستانا ئاوی‌زیندەگانی هـەلقولی، پەرداغی بەفراوی بە دەستەوە گرتووەو شەکری تی‌کردووەو گولاوی تیکەل کردووە. نازانم بەگولاو وا بونی دل‌خوش کردبوو یا چەند دلوپی لە گولی رووی تکابوە ناوی. بە کورتی شەکراوم لەو دەسە جوانـە وەرگرت‌و خواردمەوە ژیانم سەرلەنوی وەرگرت. (شیعر)

ظمأ بقلبي لا يكاد يسيغه رشف الزلال ولو شربت بحورا

تینـویتی دلم بو نابی تیرئـاو بابش‌خومەوە چەند دەلیـایەك ئاو

(چواری)

شادی بو پیروز بەختی ئەو کەسە رووی وەها بینی بەیان هەلسی لە خەو

مەستی ساقی سوبحی مەحشەر دیتە هوش

مەستی مەی بیـدار ئەبی خو نیوەشەو

١٧ ـ (چیروك) سـالی موحەمەدخوارەزم‌شا رەحمەتی خوای لی‌بی بو کارسازی ریکەوتنی بە باش‌زانی لەگەل «خەتا»دا (١) . هاتمە مزگەوتی شـاری

---

(١) د. روستەم‌علیيف لای‌وایە کە باسی ئەو ئاشتی‌یە ئەکات کە لە سـالی ■■■

کاشغەر ، کوریکم‌دی لەوپەری ریك ئەندامی‌یا ، وە دوا پایەی جەمال وەکو پیشینان فەرموویانە ( هونراوە ) :

ماموستا شوخی‌و دولبەری‌ی فیرکرد دووری‌و گلەو ناز زورداری‌ی فیرکرد
بەم قەدو شیوەو خوو رەوشت ئینسان نەبووە لە پەری‌شیوەی‌کرد نیشان

موقەددیمەی نەحوی زەمەخشەری‌ی لە دەستابوو ئەیخویندەوە ( ضرب زيد عمراً ) واتە : زەید دای لە عەمر . ووتم ئەی کور خوارەزم‌و خەتا ریکەوتن ، زەیدو عەمر هیشتا دوژمنایەتی‌یان ماوە ! پیکەنی ، نیشتمانی لی‌پرسیم ، ووتم خاکی پاکی شیراز . ووتی لە ووتارەکانی سەعدی چی‌ئەزانی ؟ ووتم :

بليت بنحوي يصول مغاضباً علي ، كزيد في مقابلة العمرو
على جر ذيل ليس يرفع رأسه وهل يستقيم الرفع من عامل الجر

( واتە )

دوچاری نەحوی‌یەك بووم کە لیم ئەدا پەلامار
بەقینەوە ، بە چەشنی زەیدی بەرامبەری عەمر
لەسەرکیشانی دامەن هەل‌نابری سەریشی
بەلی ناریکی‌ی نەحوو رەفعە لە عامیلی جەر

هەندی چووە بیرکردنەوە ، ووتی شیعرەکانی ئەو لەم زەمینە زورترفارسی‌یە . ئەگەر فارسی بلییت لە تی‌گەیشتن نزیکتر ئەبی . ( كلم الناس قدر عقولهم ) . لەگەل خەلکا بە پی‌ی عەقل‌و تی‌گەیشتنیان بدوی ووتم :

---

١٢١٠دا لە نیوان خوارەزمشاەمەحموودو قەرەکیتایا مورکرا . ئەگەر سەعدی حیکایەتەکەی وەرنەگرتبی ، ئەوا بوونی ئەو لە کاشغەر لەم‌کاتەدا شتیکی زور گرنگە لە میژووی ژیانیدا . ( ع.م )

تاوەکو تـەبعت هەوەسی نەحوی‌کرد        شیوەیی عەقلی لە دلم مەحوکرد
ئەی دلی دلدار لـە داوی تودا        ئیمە خەریکی توو ، تو عەمرو زەید !

بەیانی‌یەك کە نیـازی سەفەرمان‌کردبوو ، توومەز کەسیك پی‌ی‌ووتبووفلان ـ کەس‌سەعدی‌یە ، بە راکردن هات لوتفی‌نواندو داخی‌خوارد کە ئەم چەند کاتە بوچی نەت ووتووە کە فلانم ، هەتا بە سوپاسی هاتنی گەورەپیاوان کەمەری خزمەتم بیەستایە . ووتم ( نیو شیعر ) :

تو لە شوینیکی لە من دەنگ نایە بەو واتەی منم.

ووتی چی ئەبی ئەگەر لەم خاکە روژی بحەسیتەوە هەتا لە خزمەتتا بەهرەمەند ببین ؟ ووتم ناتوانم ریکی ئەم چیروکە هونراوەیە :

گەورەییکم دی لە پای کوساری        لە جیهان رازی بە ژووری غاری
ووتم تەشریفت بو نایەیتـە شـار        لە دل لا بدەی عەزمی بەندی غـار
ووتی شـار پریە لـە پەری روویان        گول کاتی زور بوو فیـلی خلیسکان

ئەوەم ووت‌و سەرورووی یەکترمان ماچ‌کردو مال‌ئاواییم خواست (مەسنەوی)

کەلکی کوا ماچی سەرگونەی دلدار        بو دوعاخوایی لە یەك‌کەن هـاوار
بوچ سیو لە یاران دوعاخوایی‌کرد
نیـوەی رووی‌سوورەو نیوەکەی کەی زەرد

إن لم أمت يوم الوداع تأسـفاً        لا تحسبوني في المودة منصفـاً
روژي مال‌ئاوايی نەمرم‌گەر لە داخانا برا
وا مەزانە خاوەن ئینسافم لە عەشقی دولبەرا

١٨ ـ ( چیروك ) خەرقەپوشێ لە کاروانی حیجازا هاوریمان‌بوو ، یەکی لـە سەردارانی عەرەب سـەد دیناری دایە کە قوربانی‌ی بو بکات ، دزانی هوزی

خوفاجی له ناکاو دایان بەسەر کاروانەکەدا پاکیان برد . بارزگانەکان دەسیان کرد بە گریان‌وزاری‌و هاواری بی‌سوودیان ئەکرد . ( شیعر ) :

گەر زاری بکەی یا هاواری‌وا مالی دز بردی نای‌گیریتە دوا

تومەز دەرویشیکی پیاوچاك لەسەر شیوەی خوی مابوو ، تیك‌نەچووبوو ، پیم‌ووت بوچی ئەوەی لای تو بوو نەیان‌برد ؟ ووتی بەلی بردیان بەلام ئەوەندەم خوونەدابوویە کە لە کاتی جیابوونەوەیا بوی نەخوش‌کەوم . ( شیعر ) :

مەبەستە بە کەس بە هیچەوە دل وەرگرتنەوەی دل کاریکە موشکل

ووتم ئەوەی ووتت ریکی حالی منە کە من لەگەل جوانی لە کاتی گەنجیما وا ریکەوت تیکەلی‌و خوشەویستی‌یەکی راستمان هەبوو ، تا رادەیەك قیبلەی چاوم جەمالی ، وە سوودو سەرمایەی ژیانم ویسالی بوو ( چواری ) :

مەگەر فریشتە لەسەر ئاسمان وەها بی جوان

بە جوانی‌ی شیوەیی ئەو لەم زەمینە نابی کەس

قەسەم بە دوستی حەرامە لەسەر ئەوا هەمدەم

لە تووی ئادەمی ئینسانی وا نەکەوتە دەس

لە ناکاوی پی‌ی بوونی بە گلی نەبوونا روچوو ، وە دووکەلی جیایی لە بنەچەیەوە بەرزبووەوە . روژەها لەسەرخاکی هەم‌نوشینیم‌کرد . لە ریزی ئەو شتانەی لە دووری‌ی ئەوا ووتم یەکی ئەمە بوو ( پارچە ) :

خوزگە ئەو روژەی بە پی‌ی تودا ئەچوو درکی ئەجەل

دەستی گیتی تیغی فەوتانی ئەنامە تەوقی‌سەر

تاکو بیتوو لەم جیهانە نەی‌دیایە چاوی من

چون لەسەرخاکت منم دانیشتووم خاکم‌بەسەر

( پارچە )

ئەوکەسەی نەیبوو هیچ ئارام‌و خەو     تاگول‌و نەسرین نەسرەوتایە شەو
وا دەستی گیتی گول‌رووی وەران     لەسەر خاکەکەی ئەو درکی روان

لە دوای جیابوونەوەی ئـەو خوم وا دلنیـاکرد کە ئیـــتر فەرشی ئارەزوو رانەدخەم ، وە نزیکی کەس‌دانەنیشم . ( پارچە )

دوینی وەك تاوس لە باغی وەسلی ئەو نازم‌ئەکرد
ئیمرو دوورکەوتە لە یارم پیچ‌ئەخوم مانەندی مـار
کەلکی دەلیا زورە نەبوایە ئەگەر ترسی شەپول
هەم‌دەمی گول خوشە نەتبی تو ئەگەر ترسی لە خار

١٩ ـــ ( چیروك ) ووتاری لەیل‌و مەجنوون‌و شورو شیوەی ئەویان بە یەکی لە پاشایانی عەرەب ووت کەبەتەواوی فەزل‌و بەلاغەتەوە لە بیابانا سەزی‌ناوەتەوە ، وە جلەوی دەسەلاتی لە دەســـت‌داوە . فەرمانی‌دا هینایانە روو کەوتە تانووت لیدانی‌کە لە شەرەفی نەفسی ئادەمیزاد چ‌کەم‌وکووریت‌دی کـە خوت‌گرتووە بـە جانەوەرانی دەشـتەوە ، وە وازت لـە هاونوشینی‌ی ، ئادەمیزادهیناوە ؟ مەجنوون نالانی ، وە ووتی :

( شیعر )

وربّ صدیق لامنی فی ودادها     الم یرها یوماً فیوضح لی عذری ؟
زور هاوری‌تانەی لە حوبی لی‌دام     بو نەیدی روژی بیانووم دەرکەوی
خوزگە ئەوانەی تانەم لی‌ئەدەن     ئەی‌یار ئەیان‌دی رووی دولبەری
تـا تویان ئەدی لـــە باتی ترنج     بی‌ئاگا دەســـتی خویان ئەبری

هەتا راستی‌ی مەعنا لەسەر شیوەی‌دەعوام شەهادەتی‌بدایە ( فذلکن الذي لمتنني فيه ) ئەوەتان بوو تانووت‌تان تیا لی‌ئەدام .

پادشا به دلیاهات جەمالی لەیلا ببینی هەتا بزاتی چشیوەیەکی هەیە کە بووەتە هوی ئەم بەلاو فیتنەیە ؟ فەرمانیدا بوی‌بینن . بە تیرەکانی عەرەباگەران ، تا هینایانە دەست ، وە لە خەیمەی پادشادا دایان‌نا . لە شیوەی‌ووردبووەوە ، بە کەم هاتە بەرچاوی چونکە کەمترین کارەکەری ناومالی بە جەمال‌و وزینەت لەو زیاتربوو. مەجنون بە ژیری تی‌گەیشت . ووتی لە دەروازەی چاوی مەجنوونەوە سەیرکردن پیویست بوو هەتاووردی‌ی تەمەشا بو تو دەرکەوتایە ! ( شیعر ) :

ما مر من ذكر الحمى بمسمعي        لو سمعت ورق الحمى صاحت معي

يا معشر الخلان قولوا للمعا        فى : لست تدري ما بقلب الموجع

ناوی کوی وەك دیتە گویم گەر کوتری ئەو کویە وا
بیتەگوی هاوارئەکا ریك هەروەکو هاواری من
ئەی گەلی دوستان بلین بەو تەندروستە راستە تو
پیت نەزانیوە دلی پرئیش‌و پرئازاری من

( پارچە )

دەردی زام نی‌یە لای تەندروستان        مەلی دەردی خوت مەر بە هاودەردان
بی‌سوودە ووتن لە زەردەوالە        بەوەی نەیدیوە هەرگیز پیوەدان
تانویش تی‌نەگەیت بە چەشنی ئیمە        حالمان ئەنوینی لەلات وەك ئەفسان

٢٠ـ ( چیروك ) ئەگیرنەوە کە قازی‌ی هەمەدان لەگەل کورە نالبەندیکا سەرخوش‌بوو . نالی دلی لە ئاگری نارەحەتی‌ی روزگارا بوو بە ئارەزوو چاوەروان. ریکی حالی خوی ئەیووت :

ئەو سەروی قەد بلندە لەگەل هاتە بەر دووچاو
دلی لە دەس‌فران‌و دوو پیمی لە جی‌ی خزان

ئەو چاوکراوە بزدی دلی من بە هوی کەمەند
تا دل نەدەیتە کەس بیەستە دووچاوت لە رووی کەسان

بیستم لەگوزاریکا تووشی قازی‌بوو هەندیکی لەو ووتارانە بەرگوی کەوتبوو ، بە ئەندازەیەك رەنجابوو بەیان‌ناکریت . جنیودانیکی بی‌پەروایانەی دەس‌پی‌کردو ناشیرینی‌ووت ، وە دەستی دایە بەردهەل‌گرتن ، لە بی‌حورمەتی هیچی‌نەهیشتەوە . قازی بە یەکیکی‌ووت لە زاناگەورەکان کە هاودەمی خوی‌بوو :

ئەو دولبەرە ئەو گرتنی قینەی بینە     ئەو پەنجە لەناوبروی ترش‌و شیرینەی بینە

لە وولاتی عەرەب ئەلین : (ضرب الحبيب زبيب) لیدانی خوشەویست میوژە .

لە دەست تو مستی بو ناودەمم‌دان     خوشترە لە دەستی خوم پی‌ی بخوم نان

هەروەها لە بی‌شەرمی‌ی ئەو جەوانمەردی دەرئەکەویت . ( شیعر )

تری تازەبی ترشە تامی لە دەم     بوەستی دوو سی روژی شیرین ئەبی

ئەوەی ووت‌و هاتەوە بو سەر کورسی‌ی قەزاوەت . چەند کەسی پیاوی گەورەی عادل لە ئەنجومەنی دادگای ئەوابوون زەمینی خزمەتیان ماچ‌کرد کە بە ئیزنی ئەو چەند ووتەیەك لە خزمەتیا ئەلین ئەگەرچی بی ئەدەبی‌یە ، چونکە گەورەکان فەرموویانە ( شیعر ) :

نەك لە هەمو ووتار باس کەی رەوایە     خەتا لە گەورە ، گرتن خەتایە

بەلام لەبەر ئەوەی نیعمەتی رابووردووی ئەو گەورەیە لە هەموو روژانا بو بچووکان بەردەوام بووە ، ریکی کاریك ببینن‌و پیت نەلین جوریکە لەخەیانەت . ریگەی راست ئەوەیە لەگەل ئەم گورە نزیك بە تەمای نەکەویت ، وە فەرشی خوشەویستی‌ی لی‌رانەخەیت . پایەی قەزاوەت پایەیەکی بەرزوپتەوە تاوانی ناشیرینی لی‌هەل‌مەسوو ، دوستەکەت ئەوەبوو کە دیت ، وە ووتاری ئەوە بوو کە بیستت !

( مەسنەوی ) :

پیاوی بێئابروو بوو بێ فراوان　　چباکی هەیە لە ئابرووی کەسان ؟
زۆر ناوی پاکی کانی پەنجاسال　　بە ناوێکی پیس ئەبێ پایەماڵ

قازی ئامۆژگریی یارانی لا پەسەندهات بە دڵ ، وە ئافەرینی هەست و بیریانیکرد ، وە ووتی ئەی خۆشەویستەکانم ووردبوونەوە لە کارسازیی منا عەینی راستیە ، وە ووتاریکی بێوەلامە ، بەلام ( شیعر ) :

لو ان حباً بالملام یزول　　لسمعت افکا یفتریه عذول
گەر خۆشەویستی بە ئانووت لاچی　　ئەبێ بوختانی چاکانم بیستی

( تاك )

هەرچی ئەتوانی نەسیحەت ووتن　　بەلام کەی ئەشی ژەنگی رەش شتن

( تاك )

یادی تۆم زۆرە لە دڵ غافڵ لەتۆ نابم بە هیچ
ماری سەرکوتراوەم و توانام نی‌یە بێتاب و پیچ

ئەمەی ووت و چەندکەسی بە دوای کورەدا ویلکردو بەخشایشی زۆری رژان. ووتویانە : هەر کەسی زەری زۆری لە تەرازووە ، هێزی زۆری لە بازووە (تاك) :

هەرکەس زەریدی سەری دانەوان　　تەرازووی ئاسن بێ لەسەرشان

بە کورتی شەوی خەلوەتی بۆ سەرگرت . هەر لەو شەوەدا پاسەوانانی شار پێیانزانی کە قازی لە خۆشی‌یا خەوی لێنەکەوتووەو بە گۆرانی‌یەوە ئەمانە ئەڵێ :

( هۆنراوە )

ئیمشەو کەڵەشێر لە کات ناخوێنێ　　عاشق باوەش و ماچی لاماوە (۱)

(۱) لە نوسخەکەی موسکودا ئەم بەیتەش هەیە :

لە پیچی زوڵفی تەرا مەمکی یار ئەڵییت　　گۆی عاجە وا لە ناو قەفی گۆچانی ئابەنوسا

زینهار تا چاوی فیتنه نووستووه   بیدآر بـه ژیان نەروا بـه باوه
تا نەبییت بانگی مزگەوتی جومعه   یا زرمەی دەهول لەلای سەراوه (١)
بـه قوقەی پووچی کەلەشیر لادان   لیوت لەسەر لیو ، شیتی‌ی تەواوه

قازی لەو حالەدا بوو یەکی لە خزمەتکارانی هات‌و ووتی بوچ دانیشتوویت ، هەلسەپی هەتا پیی راکردنت هەیە راکە ، حەسوودان لەسەر تو قەیی‌یان گرتووه بەلکە راستیان ووتووه تا ئاگری ئاشووب کەمە بەلکو به ئاوی تەدبیربنیشیتەوه ، سبەینی که بەرزبووەوه عالەمی داگیرئەکا   قازی بـه زەردەخەنەوه تەماشـای کردو ووتی :

پەنجه له راوا ئەگەر شیری گرت   چی ئەی ئەگەر ریوی بوەســـتی
رووکەره رووی دوست وازبینه دوشمن   یـا هەر بیگەزی که پشتەدەستی

هەر لەو شەوەدا پادشایان ئاگادارکرد که له وولاتی‌تودا کردەوەیەکی وەها ناشیرین رووی‌داوه ، چی ئەفەرموویت ؟ پادشاووتی من به فازیلی زەمانو یەکتای روزگاری ئەزانم ، رەنگه دوژمنانی تیا سەرگەرم‌بووبن . ئەم ووتەیه نایەته گوی‌ی قوبوولی منەوه مەگەر خوم ببینم . حەکیمان ووتوویانه ( شیعر ) :

به توندی‌و پەله دەست بو تیغ بردن   پەشیمانی‌یـەو پشـتی دەس‌گەزتن

بیستم له بەرەبەیانا پادشا لەگەل چەند پیاویکی تایبەتی‌یا گەیشته ژورسەری قازی . ئەوەی له ناشیرینی بیستبووی چاوی‌پی‌کەوت . قازی لـه خەوی مەستی‌یا ئاگاداری پادشا نی‌یه . پادشا ورده ورده به نەرمی خەبەری کردەوه ، ووتی هەلسه روژهەلاتووه ، قازی تی‌گەیشت مەسەله چی‌یه ، ووتی له کام‌لاوه هەلاتووه ؟ ووتی له روژهەلاتەوه . ووتی سوپاس بو خوا که هیشتا دەرگای تەوبه ئاوالەیه ، بـــه

(١) سەرای ئەتابوك .

گوێرەی فەرموودەی پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەربێ کە فەرمویەتی ( لا تغلق باب التوبه علی العباد حتی تطلع الشمس من مغربها ) واتە دەرگای تەوبە لەسەر خەلك داناخرێ تا رۆژ لە رۆژاواوە هەڵنەیەت ( استغفرك اللهم واتوب الیك ) خوایە داوای لێ خۆشبوونت لێئەکەمو توبەت لا ئەکەم ( پارچە )

دووشتبوون منیان خستە ناوتاوان عەقلی ناتەواو بەختی رەشدوان
گورفتاربووم شایانی ئەوەم بمبەخشی چاتر نەوەك سزادان

پادشا ووتی لەم حالەدا کە ئاگاداری تاوانی خۆت بوویت سوودی نی‌یە ( فلم یك ینفعهم ایمانهم کما رأوا بأسنا ) ، واتە لە کاتی دووچاری سزابوونیانا باوەرکردنیان سوودی نەدانێ .

نەتوانی کەمەن بگرێتە سەرکۆشك چسوودی هەیە تەوبەت لە دزی
بالاکورت دەستی ناگاتە سەرلق بە میوە بلی بەسیەتی بەرزی

تو لە دوای ئەم ئیشە ناشیرینە کە دەرکەوت ریگەی رزگاریت بو پەیدا نابیو سزا پی‌سپیرراوان سزایان هاویشتەسەر . ووتی لە خزمەت پادشادا یەك ووتەم ماوە، پادشا بیستی ، ئەوە چی‌یە ؟ ووتی : ( پارچە )

بەم بی لوتفی‌یە ئەیدەی بەسەرما بە تەما مەبە ئەبم دەست بەردار
گەر لەم تاوانەیش رزگارم نەبی بە بەخشایشت هەرهەم هیوادار

پادشا ووتی ئەمووردی‌یەت بی‌وینەبوو ، وە ئەم نەستەقەت نایاببوو ، بەلام ریکی عەقل نی‌یە کە بە زانایی‌و زمانرەوانی لە چنگی سزای من رزگاریت دەس‌کەوی . کاری‌ریك لەوەدا ئەبینم کە لەسەر قەلاوە سەرەوژیرت کەم تا کەسانی‌تر ئاموژگاریت لی‌وەرگرن‌و پی‌ی وریابنەوە . ووتی : ئەی خاوەندی جیهان! من پەروەردەی نیعمەتی ئەم خانەدانەم ، وە ئەم تاوانە لە جیهانا وەنەبی هەر من

کردیتم ، کەسی کی کە بخەرەخواری هەتا من وریابیمەوە . پادشا پیکەنین گرتی وە بە چاوپوشی لە تەوانەکەی بوورد ، وە ووتی بە وانە کە بە سـەختی بریاری کوشتنیان دابوو :

هەموو هەلگری عەیبی خوتانن — بەس تانووت بدەن لە عەیبی کەسان

۲۱ــ ( چیروکیکی هونراوە )

گەنجیکی پاكدەست پاكژ دەمرووو — لەگەل جوانیکا سەودای عەشقیبوو

خویندمەوە کەوا لە دەلیای ئەعزەم — کەوتنە گیژاوی هەردوو دل بە غەم

مەلەوانی هات کە دەستی بگری — تا رزگاریکا لە گیژاو نەمری

لەو گیژاوەدا وا هاتە گوفتار — لە من وازبینە ، رزگار کە دلدار

لەم گوفتارەدا شیوا جیهانی — ئەیانبیست بە دەم دەرچوونی گیانی

ئەیووت درویە کە پیاوی بە هوش — عەشق لە سەختی بکا فەراموش

یاران ئەیانکرد وا زیندەگانی — پرسە لیکەوتوو ئەگەر نازانی

سەعدیئەزانیکە عەشقبازی — هەروەکو بەغداو زمانی تازی (۱)

دلارامت بوو پیوە دلبەستە — ئیتر لە عالەم هەموو چاوبەستە

بینەوە ژیان لەیلاوو مەجنوون — ووتاری عەشقی نامەم ئەنووسن

# بەندی شەشەم

## لاوازیو پیری

۱ــ ( چیروك ) لەگەل دەستەیەك تیگەیشتووان لە مزگەوتی شامدا باسیکم ئەکرد ، گەنجی هات ووتی لەم ناوەدا کەسی هەیە فارسی بزانی منیان نیشاندا .

---

(۱) تازی : عارەبیی فەسیحە .

پیم‌ووت: خیره؟ ووتی پیریکی‌سه دوپه‌نجا ساله له حالی گیانه‌لادایه به زمانی فارسی شتیك ئه‌لی ئیمه لی‌ی‌تی ناگه‌ین ئه‌گه‌ر به پیاوه‌تی ره‌نج‌بکیشی پاداشت هه‌یه، ره‌نگه وه‌سیه‌تیکی هه‌بی، کاتی گه‌یشتمه ژوورسه‌ری ئه‌م به‌یته‌ی ئه‌خوینده‌وه (پارچه)

ووتم به‌رمه‌سه‌ر چه‌ند ده‌می ئاره‌زوو دریغا که گرتوویه ریگه‌ی نه‌فه‌س

له‌خوانی هه‌موو ره‌نگی‌ژین چه‌ند ده‌می دریغا که خواردمان‌و ووتیان ده به‌س

مه‌به‌ستی ئه‌م ووتاره‌م به شامی‌یه‌کان ووت، لی‌ی سه‌رسام‌بوون له دریژی ته‌مه‌نی‌و داخ‌خواردنی به‌و جوره بو ژیانی جیهان. ووتم چونی له‌م حاله‌دا؟ ووتی: (پارچه)

چ‌سه‌ختی ئه‌کا به گیانی که‌سی له دانه‌کانی ده‌ربینی دانی

لی‌وه بروانه له سه‌عاتیکا ده‌رچی له له‌شی شیرینی گیانی

ووتم یادی مردن له دل ده‌رکه‌و ریگه به وه‌هم مه‌ده داگیرت‌بکا. فه‌یله‌سووفانی یونان ووتوویانه میزاج‌و ته‌بیعه‌ت ئه‌گه‌رچی راست بی، پشت به‌مانه‌وه به‌ستن شایان نی‌یه، وه نه‌خوشی هه‌رچه‌ند گران‌بیت نیشانه‌ی ته‌واو نی‌یه له‌سه‌ر مردن. ئه‌گه‌ر ئه‌فه‌رموویت پزیشکیکت بو بانگ‌بکه‌ین چارت‌بکا. چاوی‌گیراو ووتی: (مه‌سنه‌وی)

ده‌ست به ده‌ستا ئه‌دا پزیشکی چاك دی که په‌رپووته یاری که‌وتوو له خاك

گه‌وره بیری له نه‌خشی هه‌یوانه له بناغه که خانوو ویرانه

پیره‌میرد گیان ئه‌دات‌و ئه‌شنالی پیره‌ژن سه‌نده‌لی له له‌ش مالی

کانی تیکچوو به‌رابه‌ری له میزاج چاره‌ناکا که‌سی دوعاوو عیلاج

٢ـ (چیروك) ئه‌گیرنه‌وه پیری گه‌نجیکی خواستبوو، ژووری به‌گول رازاندبووه‌وه، به ته‌نیا له‌گه‌لیا دانیشتبوو، چاوودلی پیوه به‌ستبوو، شه‌وه‌های‌دریژ

نە ئەنووست ، قسەی نەستەق‌و خوشی بو ئەکرد بەلکە سلی لی‌نەکاو قیزی‌لی‌نەیەتەوە لەگەلیا رابویریت ، لـەوانە شەویك پی‌ی‌ووت بەختی بلندت یارو چاوانی دەولەتت بیداربوون کە کەوتیتە هاوری‌یەتی‌ی پیریکی پوختەپەروەرەی جیهاندیدەو ، بـــە ئارام‌سەرماوگەرما کیشاوو چاك‌وخراپ تاقی کەرەوە کە مافی هاوری‌یەتی ئەزانی‌و مەرجی خوشەویستی ئەهینیتە جی . دل‌نەرم‌و میهرەبان خوش‌سروشت‌و شیرین‌زمان.

( مەسنەوی ) :

هەتا ئەتوانم دلت دینمـــەدەست ئازارم بـــدەی ناتکەم ئازوردە

گەر وەکو تووتی هەر شەکر بخویت بە گیانی شیرین ئەتکەم پەروەردە

دووچار نەبوویت بە دەستی جوانیکی لە خوبایی ، کەللەسەر تیژی ، پی‌سووك ، کە هەردەمە هەوەسی وەرگریت‌و ، هـــەر ئانی بریاریك بریاری لی‌بدا ، وە هەر شەوی لە جیگەیەك بکەویت ، وە هەر روژەیاری بگریت . ( پارچە ) :

جەوانان هەرچەند ماە روخسارن بـەلام لەگەل کەس نی‌یە وەفایان

بە تەما مەبە وەفای بولبولان هەردەم بو گولی ئەکەونە ئەلحان

بە پیچەوانەی پیران کە بە عەقل‌و ئەدەب ژیان ئەبەنەسەر ، نەوەك هەواخواهی‌ی نەزانی‌و جوانی . ( تاك )

لە خوت چاکتر پەیاکە هەل‌بزانە لەگەل وەك خوت ئەکەی وون ئەوژیانە

ووتی لەم شیوەیە هەرچەندی ووتم وام‌زانی دلی هاتوەتە زنجیری منەوە ، وە بووە بە نیچیرم . لە پر هەناسەیەکی سـاردی لە دلی پر دەردەوە هەل‌کیشاو ووتی ئەوەندە ووتار کە تو ووتت لە تەرازووی عەقلی منا گرانی‌ی ئەو یەك ووتەیەی نی‌یە ، کاتی بیستم لـە لەلەی خوم کە ئەیووت ژنی جوان تیری بە کەلەکەیەوە بی باشترە لەوە کە پیری لە پالیا دانیشی . .

لما رات بين يــدي بعلها شيئاً كأرخى شــفة الصائم
تقول هذا معــه ميت وانما الـرقي للنــائم

واته :

ژن دی لەبەردەست میردی شتی‌یەك شورتر لە لچی پیاوی روژوەوان . .
ئەلیت پی‌ی ئەمەی لە لای مردووە بو نووستوو نووشتە ئەنووسن کەسان

چوارینە :

ژن لەگەل میردی ئیسك قورس هەلسا لـەو مالە ئیـــتر قرەو هەرایـە
پیری نەتوانی لە جی‌ی خوی هەلسی بـــە عەسا نەبی بافتی عەسایە

بە کورتی رەنگی ریکەوتنی نەبوو ، رووی‌کردە جیابوونەوە . کاتی عیددەی بەسەرچوو مارەیان‌کرد لە جوانیکی توورەو ترش‌روو ، کەم‌دەست‌و بەدخوو . جەورو جەفای ئەدی‌و رەنج‌و سزای‌ئەکیشا . سوپاسی خوای بەجی‌ئەهینا کە سوپاس بو خوا لەو سزا بە ئیشە رزگارم‌بوو ، وە بەم خوشی‌یە پایەدارە گەیشتم ! ( تاك ) :
بە هەموو جەورو هەموو توند خوویی نازت‌ئەکیشم چونکە شیرین‌رووی

( پارچە )
روومەتی جوان‌و هەم کراسی‌جوان
سەندەل‌و عوودەو رەنگ‌ونوون‌و هەوەس
جوانی‌یە بو ژنان ئەمانە گشت مەردی‌یە جوانی پیاوە ئیتر بەس ! (۱)
( پارچە )
لەگەل تو سووتان لە ناو سزادا لەگەل یەکی‌تر نەك بچمە بەهەشت

(۱) لە نوسخەیەکدا ئەم نیو بەیتە بە جوریکی‌تر نووسراوە ، لامان رەوا نەبوو بی نووسین . (ع.م)

بونی پیاز لە دەم جوانی چاترە
نەك گولی لە دەست ناشیرینو زوشت (١)

٣ــ (چیروك) میوانی پیری‌بووم لە دیاربەکر کە مالیکی فراوانی هەبوو لەگەل کوریکی رەنگ‌و رووجوان. شەویك باسی بو کردم کە لە ژیانما هەر ئەم کورەم هەیە، دەرختی وا لەم دولەدایە زیارەتگایە، خەلکی ئەچن بو زیارەتی. شەوهای‌دریژ لە بنی ئەو درەختەدا نالاندوومە تا خوا ئەم کورەی پی‌بەخشیم. گویم لی‌بوو ئەم کورە بە ئەسپایی بە هاوری‌کانی ووت ئەگەر ئەو دەرختەم بزانی‌بایە کامەیە ئەچووم لە بنی‌دا ئەپارامەوە خوا باوکم بکوژی! (حیکمەت) ماموستا شادمانە کە کوری عاقلە، کوریش تانووت لی‌ئەدا کەوا باوکی پەرپووتە. (پارچە)

سالەها ئەروا بوت ری‌ناکەوی گوری باوکی خوت بکەی زیارەت
تو بو باوکی خوت چیت کردوە بە خیر
تا چاو ببریتە خیری کورەکەت

٤ــ (چیروك) روژی بە سەرکیشی‌ی جوانی خیرا رویشتبووم، شەو لە بناری کیویکا سستمابوومەوە. پیرەمیردیکی لاواز لە دوای کاروانەوە ئەهات، ووتی بوچی کەوتوویت، کەی ئیرە جیگەی نووستنە؟ ووتم چون بروم قاچی رویشتنم نەماوە؟ ووتی ئەوەت نەبیستووە کە خاوەن‌دلان ووتویانە رویشتن‌و دانیشتن چاترە لە راکردن‌و سست‌بوون. (پارچە)

بە هەوایی قوناغ پەلەپەل مەکە پەندم وەرگرە توانا فیربە وا
بە پەلە ئەروا دوو غار ئەسپی چاك حوشتر بە هیواش شەوو روژ ئەروا

٥ــ (چیروك) نەوجوانیکی نازك‌و چوست دەم بە پیکەنین شیرین زمان لە

---

(١) زوشت، بە فارسی ناشیرینە. (ع.م)

ریزی رابوردووانی ئیمەدا بوو کە هیچ جورە غەمی نە ئەهاتە دلیەوە ، وە لیوی لە پیکەنین نەئەکەوت روزگاریکی بەسەراهات کە بە یەکگەیشتنمان ریك نەکەوت، دوای ئەوە دیم ژنی خواستبوو ، وە منالی پەیداکردبوو ، ریشەی شادمانیی براوەو، گولی رووی پەژموردە بووە ، پرسیم چ حالیکە ؟ ووتی تا منالانم پەیداکرد ئیتر منالیم نەکرد .

مـاذا الصبـا والشیب غیر لمتی | وکفی بتغییر الزمان نذیرا
منالی چی ، سپی کرد پیری وا سـەر | بەسە ترسینەریی گورینی دەوران
لە منالیی خوت بە دەس بەردار | پیرە ، یاریی خوت بدە هەرزەکار

( مەسنەوی )

شادیی جوان لە پیر تو مەکە داوا | ئاو لـە جوگە روی ناگەریتە دوا
زەرعات کە گەیشت بە کاتی درەو | سەوزنابیتەوە ئیتر سـەر لەنەو

( پارچە )

کاتی جەوانیم ئەوا لە دەس چوو | ئاخ وداخمـە بـو خومی دلگیر
هیزی سەر پەنجەی شیریم لا نەما | ئیستا کە رازیم وەك ویز بـە پەنیر
رەشی کردبوو پیریژن مووی خوی | ووتم ئەی دایکە دیرینەیی پیر
بە فیل وا مووی خوت رەش کردەوانی
پشتی کوم چلون راست ئەکەی وەك تیر

٦ـــ ( چیروك ) کاتی بە نەفامیی جوانی شیراندم بەسەردایکما . بـە دلی خەمگینەوە لە گوشەیەکدانیشت و بە دەم گریانەوە ئەیوت بوچی ووردیی خوتت لە یاد نەما وا ئیستا درشتی ئەکەی بە سەرما ؟

چ خوشی فەرموو پیری بـە فرزەن | کە دی فیل ئەخاو بوتە فیلەتەن

گەر کانی ووردی ئـەهاتە یـادت	کە منالی بووی لـە باوەشی من
ئیمرو نەتئەکرد لـەگەل من جەفا	کە تو شیر پیاوی ، ئەمن پیرەژن

٧ــ ( چیروك ) دەولەمەندیکی چرووك کویکی نەخوش‌بوو ، خیر خواهان پی‌یان ووت بو ئەم کورە یا خەتمیکی قورئان یا قوربانی‌یەکی بو بکەیت . توزی بیری کردەوە ، ووتی خەتمی قورئان باشترە چونکە ران دوورە. خاوەن دلی بیستی ووتی خەتمەکەی بویە لا باشترە چونکە قورئان وا لەســـەر زمان ، بـەلام پارە وا لە ناوگیان ( مەسنەوی ) :

داخەکەم گەردن بو تاعەتدانان	لـەگەلیا بوایە ئەگەر پارەدان
بەد نیاز وەك کەر وەك کەر ئەمینی	ئەلحەمدی بلییت ئەو سەد ئەخوینی

٨ــ (چیروك) لە پیرەمیردیکیان پرسی بوچی ژن ناهینی؟ ووتی بە پیرەژنانەوە رانەهاتووم جا ئەوانەیش کە جوانن لەگەل منا کە پیرم چون پیکەوە ئەلکین ؟

پیری حەفتا سال جوان ئەکا بە یـاد	بـە تەمای چاوی کویری مادەرزاد
زوری پیویستە خاتوون نەوەك زەر	لە دە مەن گوشتی دوستترە گیزەر

٩ــ ( چیروکی هونراوە )

بیستم لەم بەینە پیریکی پەرپووت	خەیالی بـەستە سەربەستی جووت
کچیکی جوان رووی هیناگەوهەر ناو	قوتووی گەوهەری کە ون‌بوو لە چاو
بەشیوەی بووکی رووی کردە پیویست	بەلام لە یەکەم گوژما عەسای نووست
کەمانی‌کیشا تـەیدا لـە نیشان	سووژنی پولا ئەدووری کوپان
کەوتـەگلەیی لـەگەل دوســـتانی	کە هەرچی مالم هەبوو فەوتانی
ژن‌ومیرد شەریان هەلساو هاتەدی	لای‌قازی‌و پولیس ، جا ووتی سەعدی
ژن بی‌تاوانە بـەسی‌بی تـەشـــەر	دەستت ئەلەرزی ناسمی گەوهەر

# بەندی حەوتەم

## کەلك‌وسوودی پەروەردە کردن

١ ــ ( چیروك ) یەکی لە وەزیران کوریکی کەم‌فامی هەبوو ، ناردیە لای زانیاریك کە ئەو کورە پەروەردەکا بەلکو عاقل‌ببیت . روژەها پەروەردەی‌کردو خەریکی‌بوو ، سوودی نەبەخشی . ناردیەوە بو باوکی کەوا عاقل نابیت‌و خومی شیت‌کرد ! ( پارچە )

زاخاو ناتوانی پاکی‌کاتەوە .. ئاسنی کە خوی پیس بی‌و بەد گەوهەر
ئەسل ، جەوهەری کە خوی شایانە پەروەردە لەوا چاك‌ئەکا ئەسەر
سەگ لە حەوت دەلیا ئەگەر بشوری زورتر پیس ئەبی چونکە ئەبی تەر
گەر کەری عیسا بچیتە مەککە هاتەوە هیشتا هەر کەرەو هەر کەر !

٢ ــ ( چیروك ) دانایەك پەندی کورەکانی دائەدا کە ئەی‌گیانی باوك هونەر فیربین چونکە دەولەت‌و مولکی جیهان شایانی پشت‌پی‌بەستن نین ، وە زیووزەریش جی‌ی مەترسین یا دز بە جاری ئەیان‌با ، یاخاوەنی جیاجیائەیان‌خون . بەلام هونەر چاوگەیەکی هەمیشە ئاوەو دەولەتیکی پایەدارە . ئەگەر هونەروەر نەکەویتە دەولەتەوە باکی نی‌یە چونکە هونەرخوی دەولەتە بچیتە هەر شوینی قەدری ئەبینن‌و لە لای سەرەوە دای ئەنین . بەلام بەهونەر پاروویەك ئەکاو مەینەتیکی دیتەری . ( تاك )

دوای قەدر حوکم لە شان دیت‌گران بە ناز فیربوون‌و زوری مەردمان

( پارچە )

کاتی کەوتە شام فیتنەو بەلایەك هەرکەسی بو خوی خزایە لایەك

بچووكزادەكان كە بوویان هونـەر  لای پادشـا بوونە وەزیرو یاوەر
كورە وەزیران كە بی هونەربوون  لە گەدایی‌دا مانەوەو كەر بوون (١)

٣ــ ( چیروك ) یەكی لە زانا بەرزەكان پادشازادەیەكی فیری زانیاریی ئەكردو بی‌پەروا لی‌ی‌ئەداو بی ئەندازە لی‌ی توورە ئەبوو . جاریكیان كورە لەبەر بی توانایی شكاتی بردەبەر باوكی ، كراسی لەسەر لەشی بریندارى‌لادا . باوك دلی هاتەوەیەك ماموستای بانگ‌كرد پی‌ی‌ووت كورانی ئەهالی ئەوەندەی كورەكەی من ئازار نادەیت. هوی ئەمە چی‌یە ؟ ووتی هوی ئەوەیە لە ووتار ووردبوونەوەو گفتوگوو جوولانەوەی پەسەند بو هەموو كەس بەگشتی پیویستە ، وە بو پادشایان بە تایبەتی ، لەبەر ئەوەی هەرچی بەسەر دەست‌و زمانیانا بیت وا بەسەردەمی هەموو خەلكەوە ، ووتارو كرداری هی تر ئەوەندە گرنگ نی‌یە ( پارچە ) :

ئەگەر سەدعەیبی‌بی دەرویشی كەم‌دەس  لەهاوری‌ی‌سەد یەكی نازانی پی‌ی‌كەس
وەگەر یەك كردەوەی شا ناپەسەندبوو  لـە ئیقلیمی بـە ئیقلیمی ئەگازوو

كەوابوو پیویستە بو ماموستای شازادان لە تەهذیب‌و وریكخستنی ئەخلاق‌و رەوشتی گەورەزادەكانا ( انبت الله نباتاً حسناً ) ، كوششیكی زیاتربكەن لەوەی دەربارەی منالانی عەوام‌و گشتی ئەیكەن . ( پارچە ) :
كەسی بە ووردی فیر نەبی ئەدەب  لـە گەورەیی‌دا نابینی رزگار . .

---

(١) ئەم تاك‌و پارچەیە لە نوسخەیەكا هەیە
میراتی باوكت ئەوی فیر بە عیلم  بە روژی مالی باوكت خەرج ئەكەیت
( پارچە )
بی‌باكە خاوەن كەمال نەبی مال  سەیری نەیشیبی لەلا سوورو زەرد
پیاوی كە نەبی كراس لای هەمووان  چاترە نـەوەك كراسـی بی مەرد

داری تەر چونت ئەوی پیچیدە    ووشك بی ئاگر راست نابی لەکار
منالی کە دی جەوری ماموستا    ئیتر نابینی جەوری روزگار (١)

پادشا جوانیی راویژی مەلاو دارشتنی وەلامی لاریكهات ، خەلاتو بەخشایشیدایە وە پایەی فەرمانی بەرز کردەوە .

٤ ـــ (چیروك) ماموستای کتیبیکم لە وولاتی روژاوادیت ترش روو ، ووتار تالبوو ، مەردوم ئازارو بەدخووبوو ، بوگەنی سروشتی پاریز لی نە کراو ، کە رابواردنی موسولمانان بە چاوپیکەوتنی بەربادبوو ، وەقورئان خویندنی دلی خەلکی رەشئەکردەوە ، کومەلی کوران وکچانی پاکژو عازەب بە دەس جەفایەوە گرفتار بوون ، نە توانای پیکەنینو نە یارای ووتارو نەگونای زیوینیان تاوی زللەی هەبوو ، تاوی لە یەکیکیئەداو جاریك قاچی یەکیکی ئە کردە فەلاقە . راستی ووتە بیستم کەگوشەیەکی خەیانەتی نەفسی دیاریی دا بویان ، لییان داو دەریان کرد . لە پاشانا دانشگاکەیان دا بە پیاویکی کاردروستی خواپەرستی بیئازاری پیاوچاکی دانشمەند کە بەبی پیویست نەئەهاتە ووتار ، وە هوی ئازاری کەسی بە زمانا نە ئەهات . منالان سامی ماموستای پیشوویان لە دل دەرچوو ، ماموستای دووەمیان بە رەوشتی فریشتەییوە چاوپیکەوت . یەکە یەکە بوون بە دیو پالیان دا بە حیلمو خووی ئەوەوە ، زانیارییان لە بیر چووەوە . زور کانیان بە یاری ئەبردە سەر ، لەوحو تەختەی نوسینیان لەسەرییەکا ئەشکاند ( تاك ) .

ماموستاو فیرکەر کە نەبی ئازار    ئاگر بەرئەدەن منال لـــە بازار

لە پاش دووهەفتە بەو مزگەوتەوا تیپەریم ، ماموستای پیشووم دی دلخوشییان

---

(١) (بوستان) إن الغصون اذا قومتها إعتدلت    ولیس ینفعك التقویم بالخشب
تولە راستکەوە راستئەبیتەوە    تەختە بیسوودە لە راستکردنا

دابووەو هینابوویانەوە جیێ‌خوی ، رەنجامو ( لاحول ولا )م کرد کە بوچی جاریکی‌تر شەیتانیان کردەوە بە ماموستانی فریشتان . پیرەمیردیکی قسەخوشی جیهاندیدە گویی لی‌بوو پیکەنی‌و ووتی : ( مەسنەوی ) .

شایەك کوری نارد بو قوتانجانە لەوحەی زیوینی لە باوەش دانا
بە زەر لی‌ی‌نووسی چاتر بی‌لەلات لە رەحمی باوك جەوری ماموستات

٥ــ ( چیروك ) خواپەرستی نیعمەتیکی بی‌پایانی بە میرات بو مایەوە لە مامەیەکیەوە ، دەستی کرد بە داوین‌پیسی‌و بی‌دینی . رژاندنی مالەکەی کرد بەخوو. بە کورتی هیچ گوناهیکی ناشیرین نەما نەیکا ، وە هیچ لەوانەی سەرخوشی بدا نەما نەی‌خواتەوە . جاریك بە ئاموژگاری پیم‌ووت مایەی ئاو رەوانی‌یەو هوی ئاش‌گەرانی‌یە . خەرجی زور بو کەس دەس‌ئەدا کە دەرامەتیکی دیاری هەبی .
( پارچە ) :

بی دەرامەت بە هیمنی بە لە خەرج مەلەوانان ئەلین بە گورانی
کە نەباری لە کیوەکان باران دەجلە ووشکە بە سالی نازانی

عەقل‌و ئەدەب بگرە بەر ، لە یاری‌و گەمە وازبینە ، کە سامان برایەوە سەختی ئەکیشیت‌و پەشیمان‌ئەبیتەوە . کورە لە خوشی‌ی نای‌و خواردنەوە ئەم ووتەیەي منی نەهینایە گویی خوی ، وە خراپەی لی‌گرت . ووتی رەحەتی‌ی ئیستا بە تەشویش‌و نارەحەتی‌ی دواروژ لیل‌کردن لەگەل بیری عاقلان ناگونجی . ( مەسنەوی )

خاوەن ئامانجان خاوەن چاك‌بەختی بو سەختی‌بگرن لە ترسی سەختی ؟
برو شادی‌کە ئەی یاری دلشاد ئیمرو بو سبەی غەم مەکە بە یاد

چونە بو من کە لە بەرزی‌ی مروەتا دانیشتوومو پەیمانی نەوجوانیم بەستبوو ، وە ناوی سەخاو بەخشایشی من کەوتووەتە ناو دەمی گشتەوە . ( مەسنەوی )

ناوی که دەرکرد بە سەخاو کەرەم     نابی مور بدا لە کیسەی درەم
کەسی بە چاکی کە ناوی دەرچوو     ناتوانی داخـا دەرگانە لـە روو

سەیرم‌کرد ئاموژگاری‌ی من وەرناگریت‌و دەمی گەرمی من لە ئاسنی ساردی ئەو کارناکات . وازم لە ئاموژگاری‌ی هیناو رووم لە هاوری‌یەتی‌ی وەرگیرا وە بـە ووتاری دانشمەندان کارم‌کرد کە فەرموویانە ( بلغ ما علیك ، فان لم یقبلوا ما علیك ) . یانی ئەوەی لەسەرتە بیگەیی‌نە ، ئەگەر لی‌یان وەرنەگرتی هیچت لەسـەر نی‌یە . ( پارچە ) :

تو بلی با بـزانی لیت نابیین     چی‌ئەزانی لە هەر نەسیحەت‌و پەند
بی‌هونەر زوری ناوی ئـــەبینی     بە دووپیوە کە کەوتە کوت‌و بەند
دەست بە دەستا ئەداو ئەلی داخم     بوچی نەم‌بیست ووتاری دانشمەنـد

هەتا لەپاشان ئەوەی بە خەیالما هاتبوو لە نەگبەتی‌ی حالی بەو شیوە دیتم کە پارچە پارچەی بەسەریەکا ئەدروو ، پاروو پارووی کو ئەکردەوە . لـــە لاوازی‌ی حالی دلم هاتەوەیەك . وە بە مروەتیشم نەزانی لە حالیکی وەهادا ریشی دەرویش بە تانووت بکولینمەوەو خوی‌ی پیوەکەم . لەبەرخومەوە ووتم ( مەسنەوی ) :

هاوری‌ی سپلە پیاو لە جوشی مەستی     بیر ناکانەوە لـــە تەنگ‌دەستی
درەختی بەهــار خوی سەوز ئەبینی     بی‌گومان زســـتان بی‌بەرگ ئەمینی

٦ ــ ( چیروك ) یەکی لە پادشایان کوریکی دایەدەست ئەدیبی ، پی‌ی‌ووت وای پەروەردە بکا وەکو یەکی لـــە منـالەکانی خوی . ماموستا سـالیك کوششی لەگەلاکرد بە هیچ نەگەیشت . کورەکانی ئەدیبـــەکە خوی لـە فەزل‌و بەلاغەت‌و زمان‌رەوانی‌یا گەیشتنە ئەوپەری . پادشـا دانشمەندەکەی گرت‌و سەرزەنشتی کرد کە پەیمانت ناریك‌بوو ، وە بەجیت نەهینـــا . ووتی ئـەی پادشای رووی‌زەمین

شارراوە نەبی کە پەروەردەکردنی هەموان یەکسان بووە ، بەلام سروشتیان جیاجیا
( پارچە ) :

زیو و زەر هەردوو لە بەرد دینەدەر      لە هەر بەردیکا نی‌یە زیوو زەر
گەلاویژ بو گشت نووری یەکسانە      لایەك چەرم‌ئەکا ، لایەك هەمانە (١)

٧ــ ( چیروك ) لە یەکیك لـە پیرانی تەریقەتم بیست بـە موریدیکی ئەووت ئەوەندەی دلی ئادەمیزاد پەیوەندی بە رزق‌و مووچەوە هـەیە ، ئەوەندە پەیوەندی بـە مووچە دەرەوە بیوایە ، پایەی لە پایەی فریشتە تی‌پەرئەبوو .

فەراموشی نەکردیت زاتی ئیزەد      لە کاتی نوتفە بوویت پەنهان‌و مەدهوش
کە گیان‌و عەقل‌و هەستو تەبعی دایتی
جەمال‌و بیرو واتـەو      هەستی‌یو هوش
دە ئەنگوستی لەسـەر دوو دەست روانی
کە جوانی‌ی‌دا بە دوو قول‌و بە دوو دوش
دە بی‌هیممەت ئەمیســـتا وائەزانی      لـە رزق‌و مووچەدا ئەتکا فەراموش

٨ــ ( چیروك ) عارەبیکی دەشتەکیم دی بـە کوری خوی ئەووت : یا بني إنك مسؤول يوم القيامة فيما اكتسبت ، ولا يقال لمن انتسبت ؟ واتە : ئەی کوری خوم تو لە روژی قیامەتا پرسیاری ئەوەت لی‌ئەکەن کە چیت کردووەو ، ئەوەت لی ناپرسن خوت دایە پال کی‌و کوری کی‌ی ؟ ( پارچە ) :

---

(١) لە هەندی نوسخەدا نووسراوە ، لە هەندی شوین کە ئەستیرەی سوهەیل (گەلاویژ ) هەلدیت ، پیســـت دەباغی ئەکەن وەکو لە ( تایف ) وە لە هەندی نوسخەدا نووسراوە : دەردی‌مالات ئەبی سەری ئەبرن ، لە پیســـتەکەی هەمانە دروست ئەکەن .

کراسی کەعبە کە ماچی ئەکەن     لـە ئاوریشمی وەری‌نەگرت نـاو
لەگەل عەزیزی چەند روژی دانیشت     ئەویش وەکو ئـەو گەورەبوو تەواو

٩ــ (چیروك) لە نامەکانی پزیشکەکانا ووتراوە کە لەدایك‌بوونی دووپشك وەك گیان لەبەرانی تر نی‌یە ، بەلکو ناوسکی دایکیان ئەخون‌و سکی هەل‌ئەدرن‌و ریگەی دەرەوە ئەگرنەبەر ، وە ئەو پیستانەی لە کونی دووپشکا ئەبینرین هی‌ئەوەن . جاریك ئەم ووتە وردەم لای گەورەیەك ئەگیرایەوە ، فەرمووی بە راستی دلی‌من بو ئەم ووتەیە شـایەتی ئەدات ، وە ئەگەر وا نەبی نابی . ئەمانە لە سەردەمی ووردی‌یا لەگەل باوك‌و دایکیانا وابوون ، بویە لە گەورەییدا خوشەویست‌و ماقوولن (پارچە) :

باوکی کوری خوی ئاموژگاری‌کرد     ووتی جەوانمەرد لیم وەرگرە پەند
کەسی کە نەبی بو کەسی وەفـا     رووی دوستی نابی‌و نابی دانشمەند

( وینە ) بە دووپشکیان ووت بوچی بە زستان دەرناکەویت ؟ ووتی بە هاوین چ‌حورمەتیکم هەیە تا بە زستان بیمە دەرەوە !

١٠ــ (چیروك) ژنی دەرویشی سکی پربوو ، وە کاتی تەواوبوو دەرویش لە هەموو تەمەنیا منالی نەبووبوو ، ووتی ئەگەر خوای گەورە کوریکم پی‌ببەخشی ، جگە لەم خەرقەیەی لەبەرمایە هەرچی ترم هەیە ئەیکەم بە بەخشش بو دەرویشان وا ریکەوت کوری بوو وەکو بریاری دابوو خوانی بو دەرویشان دانا . لە دوای چەند سالی لە سەفەری شام گەرامەوە ، بە گەرەکی ئەو دوستەدا گەرام ، ئەحوالیم پرسی ، ووتیان وا لە زیندانی شاردا . ووتم لەبەرچی ؟ ووتیان کورەکەی شەرابی خواردووتەوە ، قرەی کردووەو خوینی یـەکیکی رشتووەو رای‌کردووە بـە هوی ئەوەوە زنجیر لە ملی‌و کوت لە پی‌دایە . ووتم ئەم بەلایە ئەوەیە کە لە خوای داواکرد . (پارچە) :

ژنانی بەردار ئەی مەردی هوشیار　　کانی منال‌بوون ئەگەر بیی مـار
بـەلای عەقلەوە چاترە لەوەی　　کوریکی بی خوارو ناهەموار

١١ ـــ (چیروك) منال بووم لەگەورەیەك بلووغیم پرسی ، ووتی لەکتیبا سی نیشانەی نوو سراوە، یەکەم پازدەسالی، دووەم شەیتانی‌بوون، سی‌هەم مووی‌بەر. بەلام لە راستی‌یا یەك نیشانەی هەیەو بەس : ئەوەی کە رەزای خوای گەورەو بەرزو بلندی لا زیاتر بی لـە بەشی نەفس . کەسی وا نەبی لای ئەهلی تەحقیق بـە بالغی ناژمیرن . ( پارچە )

وینەی ئادەمی ئەبی دەنکی ئاو　　چـل روژ لـە رەحەم بمینیتەوە
ئەگەر چل سال‌بی‌و بی‌عەقل‌و ئەدەب　　کەس بـە ئادمی نای‌خوینیتەوە

( پارچە )

جوان‌مەردی‌و لوتفە پی‌ی ئەلین ئینسان　　ئەم نەخش‌و ماددە هیچ نی‌یە لە کار
هونەری ئـەویت کە بکری وینە　　لـە هەیوانانا بـــە بویەو ژەنگار
جیهان خستنەدەست هیچ هونەر نی‌یە　　دلی بینەدەست ئەتوانی ئـەی‌یار

١٢ ـــ (چیروك) سالیك بەربەرەکانی کەوتبوە ناو حاجی‌یە پیادەکانەوەو منیش لەو سەفەرەدا پیادەبووم . ئینساف‌بدەم کەوتینە سەرو رووی یەکترو جنیوو ناسزا بەیەك‌دان . کەژاوە نوشینی بە هاوتای خوی‌ووت زور سەیرە پیادەی شەترەنج ئەگەر خانەکانیان بردە سەر ئەبن بە فەرزین‌و چاکتر ئەبن لەوسایان ، کەچی حاجی‌یە پیادەکان بیابان ئەبەنە سەر بەدتر ئەبن .

لەبری من بلی بـە حاجی‌ی بەلاف　　کە پیستی خەلکی ئەدری بە ئازار
کە تو حاجی نیت حوشتر حاجی‌یە　　خوراکی درکەو ئە گریتە شان بار

١٣ ـــ ( چیروك ) هیندوکی یاری‌ی نەوت هاویشتن فیرئەبوو ، دانشمەندی

پی‌ی‌ووت تو که ماله‌که‌ت قامیشه ئه‌م یاری‌یه‌ت بو ناشی بیکه‌ی به پیشه !

دوو ووته مه‌لی یه‌کی ناسه‌واب دووه‌م خراپ بی بو وه‌لام‌و جواب

۱٤ ــ (چیروك) پیاویك چاوی ئه‌یه‌شا ، چووه لای به‌یتالی بوی ده‌رمان‌بکات. به‌یتال ئه‌و ده‌رمانه‌ی چوارپی‌ی پی‌ده‌رمان‌ئه‌کرد هینای به چاویا ، کویر بوو . شکاتیان برده لای دادگه‌ر ، ووتی : برو هیچ تاوانی نی‌یه ، ئه‌گه‌ر ئه‌مه که‌ر نه‌بوایه نه‌ئه‌چوو بو لای به‌یتال . مه‌به‌ست له‌م ووته‌یه ئه‌وه‌یه هه‌تا بزانی هه‌رکه‌س ئیش به ئیش نه‌زانی بکات په‌شیمان ئه‌بیته‌وه ، وه لای خاوه‌ن عه‌قلانیش به سووك‌عه‌قل ئه‌دریته قه‌له‌م

پیاوی به هوشی رووناك بیرئاسان گرنگ ئیش نادا به پیاوی‌نه‌زان

که‌سی بای‌بدا له بانی حه‌سیر بو بادان نایبه‌ن بو کارگای حه‌ریر

۱٥ ــ (چیروك) یه‌کی له پیشه‌وا گه‌وره‌کان کوریکی مرد . لی‌یان پرسی چی له سنووقی‌گوری کوره‌که‌ی بنووسن ؟ فه‌رمووی ئایه‌تی قورئانی پیروز له‌وه عه‌زیزتره له‌و شوینانه‌دا بنووسریت که دواروژ بکه‌ویته خواره‌وه‌و خه‌لکی به‌سه‌ریا برون‌و سه‌گ پیاهه‌ل‌میزی . ئه‌گه‌ر هه‌ر زور پیویسته شتیك بنووسن با ئه‌م شیعره بی به‌سه (پارچه) :

ئای که هه‌ر کاتی سه‌وزه له باخان ئه‌روی چه‌ند خوشه ئه‌وسا دلی من

تویش وه‌ره ئه‌ی‌یار ببینه به‌هار سه‌وزه رواوه له‌سه‌ر گلی من

۱٦ ــ (چیروك) خواپه‌رستی به لای یه‌کی له خاوه‌ن نیعمه‌ته‌کانا رویشت که ده‌س‌وقاچی کویله‌یه‌کی به‌ستبوو ، سزای ئه‌دا . ووتی ئه‌ی کور وه‌ك خوای به‌رزو بلند به‌نده‌یه‌کی دیلی ده‌سه‌لاتی تو کردووه‌و ده‌سه‌لاتی به تو داوه ، سوپاسی به‌خشایشی خوای به‌رزو بلند بینه‌جی‌و ، ئه‌وه‌نده‌ت جه‌ورو جه‌فا لاپه‌سه‌ند نه‌بی بو

ئەم کویلەیە ، نەوەك سبەینێ کە روژی قیامەت دێ لـــە تو چاکتربێ‌و تووشی شەرمەزاری بێ . ( مەسنەوی )

لەسەر کویلەکان قین مەخەرەکار زوریان لێ‌مەکەو مەیان‌دە ئازار
وا بە دە درەم کریت دەست خست خو بە دەسەلات نەت‌کردوە سروشت
هەتاکەی زورو سـەرکەشی‌بو قین گەورەتر هەیـە : جیهان‌ئافەرین
خاوەن ئەرسەلان ، ئەی‌خاوەن ئاغوش(۱) فەرمان دەرانت مەکە فەراموش

لە حەدیسا هەیە لە گەورەی عالەمەوە سەلامی خوای لێ‌بێ کە فەرموویەتی گەورەترین داخ‌لە روژی قیامەتا ئەوەیە کە کویلەیەکی خواپەرست ئەبەنە بەهەشت‌و خاوەنە بێ‌دینەکەی ئەبەنە دوزەخ . ( پارچە )

کویلەیەك وا کا کە خزمەتی تو رقی لێ‌مەگرە ، مەی‌کە زور دلگیر
ئابروو چوونە لە روژی دوایی‌دا کویلە ئازادو گەورە پێ زنجـــیر

۱۷ــ ( چیروك ) سالێ لە بەلخ لەگەل شامی‌یان سەفەرم‌کردو ریگەلەبەر جەردە پر ترس‌بوو . گەنجێ بو ئاگاداری هاوریمان‌بوو ، سوپەر بازو کەوان ـ ئەندازو سیلاح شورو خاوەن‌زور ، کە دە پیاو نەیان‌ئەتوانی کەوانی ئەو راکیشن‌و زوردارانی رووی‌زەوی پشتیان لە زەوی نەئەدا . بەلام وەکـــو ئەزانی لە نیعمەتا بووبوو وە لە سیبەرا پەروەردە بووبوو ، نە جیهان‌دیدە بوو وە نەسەفەرکـــردە . گرمەی تەپلی دلاوەران بە گوی‌ی نەگەیشتبوو ، وە بریقـــەی شمشیری سورانی نەدیبوو ( شیعر ) :

بە دەستی دوژمن نەکرا بوو ئەسیر نەی‌دیبوو لە شـــەر تیربارانی تیر
وا ریکەوت لەگەل منا دوا بە دوای‌یەك ئەرویشتین ، بە هەر دیواریکی کون

(۱) ئەرسەلان‌و ئاغوش : دوو ناوی بلاوی تورکین . لیرەدا ناوی دوو کویلەن . (ع) .

ئەگەیشت بە هیزی بازوو ئەیخست ، وە هەر داریکی گەورەی ئەدی بە زوری سەرپەنجەی هەلی ئەکەند . بە شانازیەوە ووتی :

فیلی شان کورت و دووبازووی گوردان
سوپەری لەپ کورت ، سەرپەنجەی مەردان

ئیمە لەو حالەدا بووین دوو جەردە لە پەنا بەردی سەریان هینایە دەرو روویان تی کردین بو جەنگ ، یەکیکیان داریکی بە دەستەوەبوو ، ئەوی تریشیان میکوتیکی لە بن دەستابوو . بەجوانەکەم ووت خەریکی چیت وا دوژمن هات . ( شیعر ) :

دە فەرموو ئەوەی لاتە زەبروزور دوژمن بە پیی خوی ئەوا هاتەگور

دیم جوانەکە تیروکەوانەکەی لە دەست کەوتەخوارو ، ئیسکی هاتە لەرزین . ( تاك ) :

نە هەر کەسی کە بە تیر مووی قلاشت و پوشی زری
لە روژی هەلمەتی جەنگا بە پیوە خوی ئەگری

لەوە زیاتر چارەیەکمان نەدی کە وولاغ و چەك و جل و بەرگمان وازلی هیناو گیانمان بە سەلامەتی دەرکرد . ( پارچە ) :

لە ئیش وکاری گران مەردی کار دیدەی ئەوی
کە شیری شەرزە بهینیتە ناوی پیچی کەمەند
جەوان ئەگەرچی فیلەتەن و هیزی بازووی بی
لەشەر لە دوژمن ئەترسی و ئەپچری لیی پیوەند
تەبەرد ئەزانی کەسی تەجرەبەی لە مەیدان بی
وەکو لە مەسئەلەی شەرع ئەزانی دانشمەند

۱۸ــ (چیروك) دەولەمەندزادەیەکم دی لەسەر گوری باوك‌ودایکی دانیشتبوو ، وە لەگەل بیچوە‌دەرویشی لەبەربەرەکانیدابوو کە سندووقی گوری باوکی من بەردەو شتی جوانی لی‌نووسراوە ، وە بەردی مەرمەری لەژیردا داخراوە، وە خشتی پیروزی لی دامەزراوە . چون لەگوری باوکی تو ئەچی کە خشتی دوانی لی‌پیکەوەنراوە ، وە دوو سی‌مست، خولی تی‌کراوە. کوری دەرویش ئەوەی بیست، ووتی هەتا باوکت لـە ژیر ئەو هەموو بەردەگرانانە دیتە دەری ، باوکی من ئەگانە بەهەشت . (تاك)

| | |
|---|---|
| کەر هەتا شانی سووکتر بی لە بار | ئاسان‌تر ئەبی بی‌گومان بو غـار |
| دەرویش کە زوری هەژاری کیشا | لە قاپی‌ی مەرگا سووك ئەبی باری |
| کەسی لـە نازو نیعمـــەتا ژیا | مردن لـەلای ئەو زورە ئازاری |
| دیلی رزگاری بووبی لـە زیندان | چاتر لە میری بووبی دوچاری |

۱۹ــ (چیروك) لەگەورەیەکم پرسی مەبەست لـەم فەرموودەیە چی‌یە کە پیغەمبەر سەلامی خوای لی‌بی فەرموویەتی ( اعدی عدوك نفسك التي بين جنبيك ). واتە دوژمن ترین دوژمنی تو ئـەو نەفسەتە لـە نیوانی دوو پەراسووتایە . فەرمووی هوی ئەوەتە هەر دوژمنی کە خزمەتی بکەی ئەبی بـــە دوست ، نەفس نەبی تا خزمەتی بکەیت ، ناپەسەندتر ئەبی .

فریشتەخوو ئەبی ئینسان بە مەرجی کەم‌خواردن
بە چەشنی لاشەیی بیگانە گەر بخوا وەکوو حەیوان
مەبەستی هەر کەسی بینیتەجی ئیتاعەت ئەکا
نەفس نەبی ، مەبەسی دی ئیتر ئەدا فەرمان

# بەربەرەکانێی سەعدی لەگەل موددەعی بە لاف
# لە بەیانی دەولەمەندیو دەرویشی‌یا

یەکی لە وینەی دەرویشـان،نەوەك لەسەر رەوشتی ئەوان ، دیم لە ئەنجومەنیکا دانیشتووە ، دەستی کردووە بە ناشیرینی ، دەفتەری شکاتی کردووەتەوەو خراپەی دەولەمەندی ئەلی . ووتار گەیشتە رادەیەك دەرویش دەسـتی دەستەلاتی بەستراوەو زەنگین پی‌ی راستی شکاوە . ( تاك ) :

سەخی‌پیاو نی‌یە لە دەستیا درەم     خاوەنی سامان لای نی‌یـە کەرەم

منیش کەپەروەردەی دەستی بەخششی گەورەکانم ، ئەم قسەیەم لا گران‌بوو ، ووتم ئەی دوست دەولـەمەندان دەرامەتی کەم‌دەستـان‌و زەخیرەی‌گوشەنشینان . مەبەستی خاوەن‌نیازان‌و پەنای‌سەفەرکەران‌و هەلگری باری‌گرانن بو حەسـانەوەی کەسان . کاتی دەست بو خواردن ئەبەن کە دەس‌وپیوەندو ژیردەستـانیان بخون . زیادەی بەخشایشی ئەوان ئەگا بە بیوەژنان‌و پیران‌و خزمان‌و دراوسی‌یان .

( هونراوە ) :

بو دەولەمەندە لە وەقف‌و لە نەزرو میوانی
زەکات‌و فیـــترەوئازادی دیاری‌ی قوربانی
لە کوی ئەگەیتە دەولەتی ئەو تو ئەتو کە ناتوانی
مەر ئەم دوو رەکعەتە نویژە بە سەد پەریشانی

ئەگـەر دەسەلاتی بەخشش‌و جوود یا هیزی سوجوود بو دەولەمەند باشتر نەچیتە سەر کەمالیکی‌پوخت‌و بەرگیکی پاك‌و زەمینیکی ئاگاداری‌کراوو دلیکی بەتال‌و هیزی خواپەرستی لە پارووی ناژك‌و توانای خواپەرستی لە جل‌وبەرگی پاك

پەیدائەبی کە لە سکی خالی چ هێزی دیتەدەر ، وە لە دەستی بەتال چ مروەتی .
لە قاچی بەستراو چ ڕویشتنی‌و لە دەستی برسی چ خێری ( پارچە )

شەو پەراگەندە ئەنوی هەر کەسی ئەو

ڕووی نەبینرا لـــەر ڕووی بەیانانـا

میروو هاوین کە کردو کوشەئەکات دەست بەتال بی هەتا لـە زستانـا

فەراغەت‌و دلنیایی بە هەژاری‌یەوە ناوەستی ، وە گردی لە تەنگ‌دەستی‌یا وینە ناگریت . یەکی ( اللّٰه‌اکبر )ی شیوان بلی‌و یەکی چاوەروانی شیو بی چون وەکو یەك ئەبن

خاوەنی ڕوژی خەریك یەزدانە پـەریشـان ڕوژی دل‌پـەریشـانە

پاشان ، خواپەرستی‌ی ئەوان لە وەرگرتن نزیکترە چونکە گردو دل لە جین ، نەوەك پەریشـــان‌و پەراگەندە دل . هوی ژیانیان ڕیك ، وە بـــە عیبادەت‌و خواپەرستی‌یەوە خەریکن . عەرەب ئەلی ( اعوذ باللّٰه من الفقر المکب ) پەنائەگرم بە خوا لە هەژاری‌ی بەسەراکەوتوو ( وجوار من لایحب ) وە لە دراوسی‌یەتی‌ی کەسی خوشی نەویم . لە فەرموودەی پیغەمبەرایە سەلامی خوای لی‌بی ( الفقر سواد الوجه في الدارین ) واتە هەژاری مایەی ڕوورەشی‌ی هەردوو دنیایە . ووتی ئەوەت‌بیستووە ، بەلام ئەوەت نەبیستووە کە فەرموویەتی ( الفقر فخری ) واتـە هەژاری مایەی شانازی‌ی منە . ووتم بی‌دەنگ‌بە ئامانجی گەورەی عالەم سەلامی خوای لی‌بی بو دەستەیەك بووە کە مەردی مەیدانی‌ڕەزان‌و سوپەری تیری قەزان ، نەوەك ئەوانەی خەرقەی ئەوان ئەپوشن‌و پارووی ئەوان ئەفروشن . ( چواری )

ئەی وەك تەپلی بانگ لەناوەوە هیچ چارەی تویشووکە نیهایەت هیچە

پیاویت ڕووی تەماع لەخەلك وەرگیرە هەزارەی تەزبیح لە دەست مەپیچە

دەرویشی نەفام ئارام‌ناگریت هەتا ئیشی روونەکاتە کوفر ( کاد الفقر ان یکون کفرا ) واتە ـ نزیکە هەژاری بی بە کوفر . بی نیعمەت‌و سـامان رووتت بو پوشتەناکریتەوەو بو رزگابوونی گورفتار کوشش‌ناکریت . کی دەستەی ئیمە بـە پایەی ئەوان ئەگەیەنیت‌و دەستی بەرز کەی لە دەستی نزم‌ئەچیت ، وە خوایەك کە ستایشی ئەو گەورەیە لـە قورئانیکا کە لە مەعنای لانادری ، لـە نازو نیعمەتی دانیشتووانی بەهەشت هەوالی‌داوەو فەرموویەتی ( اولئـك لهم رزق معلوم ) واتە ئەوانەی لە بەهەشتان مووچەیەکی دیاری‌کراویان هەیە .

تینوو لە شەوا کە ئەچیتە خەو     سەرچاوەی ئاوە لەبەر چـاوی ئەو

لەم حالەدا من ئەم ووتەیەم ئەووت جلەوی توانای دەرویش لە دەستی خوگرتنی دەرچوو ، تیغی زمانی راکیشـا ، ئەسپی فەساحەتی لە مەیدانی بی‌شەرمی‌یا تاو داو ووتی : ئەوەندەت زیادە لە بەیانی رەوشتی ئـەوانا ووت‌و ئەوەندت ووتاری پەریشان ووت کە خەیال وا بزانی ئەمانە تریاقن یا کلیلی خانووی ئەرزاقن : کومەلی خـاوەن دەعیەو ، سەرکەشی خوپەسەند ، لە خەلکی بە فیز ، خەریکـی حال‌و نیعمەت‌و ، شەیدای گەورەیی‌و حورمەت‌و سەروەت نادوین مەگەر بە تکالی کردن، تەماشاناکەن مەگەر بە مونی ، زانایان بە سوالکەر ئەزانن‌و ، هەژاران بەبی‌سەروپی تانووت لی‌ئەدەن بە هوی مالیکەوە کە هەیانەو بە پایەو حورمەتی کە گومانی‌ئەبەن : لە ژوور هەموانەوە دائەنیشن . نە ئەوەیان لە سەرایە سەیری کەسی‌بکەن . بی‌ئاگا لە فەرموودەی دانشمەندان کە ووتوویانە هەرکەسی بە خواپەرستی لەوی‌تر کەمترە، وە بە نیعمەت زورتر ، دیمەن دەولەت دارەو بە مەعنا هەژارە ( ئاك ) :

گەر دەعیە کا بە مالی لەسەر عاقلا ئەو کەرە
تو بەکەری بزانە ئەگەر گاوی عەنبـەرە (۱)

---

(۱) شتیکی بون‌خوشە

ووتم خراپ ووتنی ئەمانە رەوا مەبینە کە خاوەنی کەرەمو بەخشش . ووتی هەڵەت ووت کوێلەی درەمن ، چ کەلکیان هەیـــە هەوری ئازارنو نابارن . سەرچاوەی روژنو رووناکی بە کەس نادەن . سواری وولاغی دەسەلاتن‌و لی‌ناخورن . هەنگاوی بو خوا دانانین‌و درەمێك بەبی‌شانازی وئازارنادەن . بی‌رەنج مال پیکەوە ئەنین‌و بە گرانی ئاگاداری‌ی‌ئەکەن‌و بە داخەوە بەجی‌ی دیلن. گەورەکان ووتوویانە زیوی پیـاوی رژد کاتی لە خاکا دیتەدەر کە ئەو خوی بچیتـە ناو خاکەوە .

بە رەنج‌و کوشش زور مالی خستە ژیرچنگی
کەسیکی‌تر چ‌بە ئاسـان لـە دەستی دەرهانی ؟

لـــە وەلاما پیم‌ووت ئاگاداریت بەســـەر چرووکی خاوەن نیعمەتەکانا وەرنەگرتووە مەگەر بە هوی گەدایی‌یەوە ، ئەگینـــا هەرکەسی واز لە تەماع بینی بەخشایش‌و چرووکی‌ی لا یەکسان ئەنوینی . مەحەك ئالتوون ئەناسی‌و گەدایش دەس‌قووچـاو . ووتی بەو تاقی‌کردنەوەیە ئەیلیم کە دەس‌وپیوەند لـە بەردەرگا رانەگرن دڵسـەخت‌و دڵرەقەکان هەڵئەبژیرن ، هەتا بین بە یاری عەزیزان و دەس‌بنین بە سنگی پیاوچاکانەوە ، وە ئەڵین کەس لە مالەوە نی‌یەو راست ئەکەن .

( تاك ) :

پیاوی کە عەقل‌و هیممەت‌و هوشی نەبوو کەمال
فەرمووی بە دەرگەوان کە بلی کەس نی‌یە لە مال

ووتم دوای ئەوەی لە دەست گەدایان هاتوونە گیـان‌و لە پارچە قاقەزیان کەوتوونە فوغان رەوای عەقل نی‌یە کە ئەگەر لمی بیابان بی بە دورو چاوی گەدایانی پی‌پڕ بی ( شیعر ) :

نیعمەتی جیهـان چاوی تەماعکار پرناکا وەك چاڵ بە ئاوی شەونم

له هەر جێیەك سەختی چەشتوویەك ئەبینی یا تاڵی كێشاویك ، بە هۆی چاو چنۆكی‌یەوە خۆی فڕێ‌ئەداتە ڕوزگاری بە ترس‌و لە سزای دواڕوژ ناكەویتە هەراس‌و حەلاڵ‌و حەرام لە یەك جیاناكاتەوە . ( پارچە ) :

ئەگەر كلویە بهاویژریتە سەرسەری سەگ
له شادمانی وەها تی‌ئەگا كە ئیسقانە
دووكەس كە دارەتەرمی لەسەر شانیان دانین
چرووك سروشتی وەها تی‌ئەگا كەوا خوانە

بەلام خاوەنی جیهان بە چاوی لوتفی خوا سەیر كراوە وە بە حەلال لە حەرام ئاگاداری كراوە . من كە هیشتا ئەم وتەیەم تەواو نەكردووە ، بورهان‌و دەلیلم بو نەهیناوەتەوە ، هیواداری ئینسافم كە هەرگیز دیوتە دەستی دوعایەك بە شانەوە بەسترابی ، وە یا بی‌تاوانی لە زینـدانا دانیشتبی یا بی گوناهی پەردەی درابی یا دەستی لەمەچەكا برابی مەگەر بە هوی هەژاری‌یەوە شیر مەردانیان لەبەر كەم‌دەستی لە كونا گرتووەو كەعبەهایان كون كردووە . جی‌ی بڕوایە كە یەكی لە هەژاران نەفسی ئەمارەی داوای ئارەزوویەكی لی‌بكاو نەتوانی بیگریت دوچاری تاوان بیت . سك‌وئالەت دوانەن(١) ، واتە بە سكی‌بوون ، هەتا ئەمیان لە جی‌دایە ئەویان بە پیوەیە . بیستوومە كە دەرویشیكیان لەگەل منالیكی پی‌گەیشتوو بە ئیشیكی پیسەوە گرت ، لەگەل ئەوەشا كە شەرمەزاربوو ، وە ترسی سەنگەساری بوو ، ووتی موسولمانینـە توانای ژن‌هینـانم نی‌یەو نایش‌توانم خوم بگرم ، ئەی‌چی‌بكەم ؟ ( لا رهبانیة في الاسلام ) واتە ڕەبەنایەتی (٢) لـە ئیسلامەتی‌دا نی‌یە . ئەوەی كە هوی ئارامی‌و گردی‌ی خەیالی دەولەمەندانە ئەوەیە كە هەر شەوی بوتی ئەگرنە

---

(١) جمعكن : (ع) (٢) تەنیـایی .

باوەش ، وە هەر روژی جوانی لە ژوورسەریانە کە زوژی رووناك لە جوانیی ئەو دەستی بی ئارامیی وا لەسەر دل ،وە سەروی خەرامان لە شەرمەزاریی ئەو پیی لە گلایە ( تاك ) :

خوینی ئازیزی داوە لەو چنگە سەرپەنجەکانی عەنتابی رەنگە

رەوانییە لەگەل جوان رووی وادا بە دەوری خراپەدا بگەریت یا رووبکاتە نارەوایی ( شیعر )

دلی کە حووری بەهەشتی رفاند بە ئازایی

کەی ئەو دلە هەیە باکی بتانی یەغمایی (١)

( شیعر )

من كان بين يديه ما اشتهى رطب يغنيه ذلك من رجم العناقيد

لە بەینی دوودەسی خوی بی کەسی مەیلی لە خورمایە

چ پیویستی بهاوی بەرد لەبو هیشوو لەسەردایە

زورتر دەست بەتالان داوینی پاکیان لە گوناهەوە ئەئالینن ، وە برسییان نان ئەرفینن . ( شیعر ) :

گەر گوشتی دەس کەوی سەگی برسی چ باکییە

هی حوشتری جەنابی سالحە ، یا هی کەری دەجال

چەند پاریزگاران بە هوی هەژارییەوە کەوتوونەتە عەینی فەسادەوە ، وە نامووسی بەرزیان بە بای ناوی شیرینەوە بەرباد بووە . ( تاك ) :

هیزی پاریزگاری نامینی لەگەل برسیتییا

رەشحەیی تەقوا نەبوونی زوو لە دەستی دەرئەدا

---

(١) مەبەس جوانیی سەرزەمینە . (ع) .

ئەوەی ووتت کە دەرگا لە رووی هەژاران ئەبەستن ، حاتەمی‌تەی کە بیابان ـ نشین بوو ئەگەر لە شاریکا بوایە لە جوشی گەدایان بیچارە ئەبوو ، وە کراسیان لەبەرا پارچە پارچە ئەکرد وەکو لە ( طیبات ) ا هاتووە ( تاك ) :

تەماشام مەکە با کەسانی‌تر نەکەن تەماشا

لە دەس گەدایان کەسی ناتوانی خیری‌کات حاشا

ووتی ئەی من بەزەییم بەوانا نایەتەوە ؟ ووتم نەء ، داخ بو مالی ئەوانە ئەخویت ئیمە واین بەم جورە لەناو ووتارو هەردو بە پەکتر دوچار . هەر پیادەیەك ئەو لی‌ی بخوری کوشش ئەکەم بو بەرهەلستی ، وە هەر شایەك بانگ‌ئەکا بە سواری دای‌ئەپوشم . هەتا نەقدی کیسەی هیممەتی هەموو خەرج‌کردو تیری جەعبەی دەلیلی هەموو هاویشت .

لە عاست هیرش ئەو دمم هەراشە ئاگات لە خوت‌بی قەلغان توور نەدەی

جگە لەفیشال ، لەهووشەو هاشە چی کە شك‌نابا ، هیچ گومان نەبەی

ئەم قسە زانی قسە ری خەرە ، ئەم دزی عیلم‌و فام‌و زانستە

وە ستاوەو دەسی لەسەر خەنجەرە

دەرگایش بی سەبەب قوفل‌و دەربەستە [1]

هەتا دواکات دەلیلی نەما زەلیلم‌کرد ، دەستی ستەمی دریژکردو بی‌سوود ووتی دەس‌پی‌کرد لەگەل رەوشتی نەفامانە کە بو بەرابەری لە دەلیل دامان زنجیری دوژمنایەتی ئەجوولینن وەکو ئازەری بوت‌تاش کە لەگەل کوریا بە دەلیل نەیتوانی

---

(١) ئەم بەیتانە بەم جورەش کراوە بە کوردی :

ها فری‌نەدەی سوپەر بو فەسیح موبالەغەیە خوازراو موستەعار

مەعریفەت دزە قافیەو ووتار چەك لەبەر قاپی‌و بەتالە حەسار

بە شەڕ بوی هەلسا . ووتی ( لئن لم تنته لارجمنك ) واتە ئەگەر نەیبڕیتـەوە بەردە بارانت‌ئەکەم . جا جنیوی پی‌دام‌و ناشیرینم ووت . یەخەی گرتم ، چەناگەیم شکاند .

ئەو لە من من لەو کەوتینە یەکتر وا پی‌ئەکەنن لە دوامان پیاوان

لە ووتەی ئیمـە پەنجەی سەرسـامی هەموو بە جـاری نایانە ناودان

بە کورتی دادی ئەم ووتارەمان بردە لای قازی‌و بەداد رازی‌بووین ، هەتا دادگەری موسولمانان کارچاکیکی بویت ، وە لـە نیوانی دەولەمەندان‌و هەژارانا جیاوازی‌یەك بلی . قازی کە حالی ئیمەی دی‌و ووتاری ئیمەی بیست سەری بردە یەخەی بیرکردنەوە وە لە پاش تی‌وردبوونەوەیەکی زور سەری دەرهانی‌و ووتی ئەی ئەو کەسەی ستایشی دەولەمەندانت ووت‌و جەفاو خراپەی هەژارانت رەوا دی ، بزانە لە هەر جی‌یەك گولی هەیە درکە . شەراب مەستی‌ی هەیەو گەنج مـار . دوری شاهوار نەهەنگی پیاوخوری لەگەلە وە خوشی ژیانی جیهانی پیوەدانی ئاکامی لـە دوایە . نیعمەت‌و خوشی‌ی بەهەشت دیواری ئازارو نارەحەتی دەوری گرتووە

جەوری دوژمن گەر نەکیشی چی‌بکا دل‌خواهی دوست

گەنج‌و مارو درك‌و گول ، خەم شادمانی پیکەوەن

تەماشا ناکەیت لە باغا داری بون‌خوش‌و داری ووشکی تیایە . دەولەمەندان سوپاس گوزارو نیعمەت ناشوناسیان هەیە ، وە لەریزی دەرویشانیشا بە تەواناو کوروزاوەی تیایە . ( شیعر ) :

دلوپی ژالە ببوایـــە بـــە دور وەك مووروی کەران بازارئەبوو پر

نزیکانی حەزرەتی باری‌ی بەرزو بلند دولەمەندانی دەرویش رەوشت‌و دەرویشانی

دەولەمەند هیممەتن . چاکی دەولەمەندان ئەوانەن خەمی هەژاران ئەخون ، وە چاکی دەرویشان ئەوانەن دەولەمەندانیان لا کەمە (ومن یتوکل علی الله فهو حسبه ) واتە کەسی پشت بە خوا ببەستی ئەوەی بەسە .

لە پاشان رووی سەرزەنشتی کردە دەرویش : ئەی کەسی کە ووتووتە دەولەمەندان خەریکی مەستیی بیدینیو خراپین ، دەستەیەك دەولەمەندان هەن لەسەر ئەم شیوەی تو بەیانتکرد کە هیممەت کورتو نیممەت ناشوناسن ، وەرئەگرن دایئەنینو نایخون وە بە کەسینادەن بەمەسەل : ئەگەر باران نەباری یا توفان جیهان هەلگریت بە پشتیوانیی دەست رویشتنی خوی لە سەغلەتی هەژاران ناپرسیتو لە خوای گەورە ناترسیت . ( هونراو ) :

| | |
|---|---|
| گەر لە نەبوونی عالەم بی هیلاك | بەلەمم هەیە لە توفان چباك |
| وراکبات نیاقاً في هوادجها | کم یلتفتن الی من غاص في الکتب |
| ژنانی حوشتر سواري کەژاوە | چباکی کەسی لە لم چەقاوە |
| دوونان کلیمی خویان بەدەر برد | ئەلین چغەمان ئەگەر عالەم مرد |

تیرەیەك ئەوانەن کە بیستت ، وە تیرەیەکیتر خوانی نیممەتیان داناوەو دەستی بەخشایشیان کردووەتەوە ، هەواخواهی ناوولیخوشبوونن ، خاوەنی دنیاو ئاخیرەتن وەکو کویلەکانی حەزرەتی پاشای عالەم ، دادگەری بەهیزکراوی زالکراو ، خاوەنی جلەوی خەلکی ، ئاگاداری کەلینی ئیسلام ، واریسی مولکی سولەیمان ، دادگەرترینی پادشایانی زەمان ، خاوەن زەفەری دنیاودین ، ئەتابوك ئەبووبەکر کوری سەعدی زەنگی خوا روژانی پایەدارتر کاتو یاریدەی بەیداغی بدات ( پارچە ) :

هەرگیز چ باوکی بە کوری وا نەکرد کەرەم
وەك دەستی جوودی تو کە بە ئەولادی ئادەمیکرد

ویستی خوا که ببەخشی بە عالەمی نیعمـــەت

بویە بە رەحمەتی خوی توی بە پادشاهی عالەمی کرد

قازی کە ووتاری بەم ئەندازەیە گەیاندو لە سنووری گومانی ئیمە ئەسپی موبالەغەی کردەدەر بە فەرمانی دادی قازی رازی‌بووین‌و وازمان لە رابوردوو هیناو لە دوای سزادانی یەك ریگەی دل نەواییمان گرت بو دروست کردنەوەی دوستی سەرمان لەبەرپێی یەکتری داناوە وە سەرو رووی یەکمان ماچ کردو دواییمان بەم دوو شیعرە هینا ( پارچە ) :

مەکە لە گەردشی گیتی شکات ئەی دەرویش

بەخت رەشـیتە بلین بەو رەوشـتەوە وا مرد

بە دەولەمەن بلی بو کامەرانی تو هەتە دەس‌و دل

بخوو ببەخشە جیهـان‌و قیـامەتت پی‌بـرد

# بەندی هەشتەم

## لە دەستوورو شیوەی هاوری‌یەتی

مال بو ئاسایشی ژیانە نەوەك ژیان بوگردکردنەوەی مال . لە پیاویکی عاقلیان پرسی چاك بەخت کی‌یەو بەدبەخت کی‌یە ؟ ووتی : عاقل کەسیکە خواردی‌و چاندی ، وە بەدبەخت کەسیکە مردو بەجی‌ی هیشت . ( شیعر ) :

مەکە تو نویژ لەسەر پیاوی لە ژین چی چاکە بوو نەی‌کرد

لە مال کوکردنا عومری بەسەرچوو ، لی‌ی نەخواردو مرد

مووسا سەلامی خوای لی‌بی ئاموژگاری‌ی قاروونی ئەکرد کە ( احسن كما احسن الله اليك ) واتە چاکە بکە وەك خوا چاکەی لەگەل تو کردووە . نەی‌بیست

دواروژیت بیست . ( پارچه ) :

هەرکەس کە بە دینارو درەم فیرنەبوو خیری
دوا روژ سەری خەرج لە دینارو درەمکرد
خواهیشتە بەری خوشیی دوودنیا ، دەبیەخشە
بەم خەلکە ، بزانە کە خوا چونی کەرەمکرد

عەرەب ئەلی ( جد ولا تمنن ) واتە ببەخشەو شانازی مەکە ، ( لان الفائدة عائدة ) چونکە کەلکەکەی بو خوت ئەگەریتەوە . ( پارچە )

دەرختی بەخشش کە دایکوتا رەگ    لقی بەرزتر ئەبی لـــە فەلەك
گەر هیواداری تو لیی بخویبەر    لـــە منەت مەنی مشاری لەسەر

( پارچە )

سوپاسیکە لە بو یەزدان ، کەوا توی خستە سەر ئیحسان
لە فەزلو نیعمەتی ئەوبوو بەتالی دانەنایت قوربان
مەکە شانازی تو خزمەت ئەکەی بو حەزرەتی سولتان
بناسە نیعمەتی ئەو توی کە بردە خزمەتی وەستان

( پەند ) دووکەس رەنجی بیسوود ئەدەنو کوششی بیکەلك ئەکەن ، یەکی ئەوەی پیکەوەیناو نەیخوارد ، ئەوەیتر ئەوەی فیربوو کردەوەی پینەکرد ( مەسنەوی ) :

هەتاکو زورتر دانش بزانی    ئیشی پینەکەی هەروا نادانی
نە پەی بو هیچبرد ، نە دانشمەندە    چوارپی کتیبی لینییت هەرچەندە
جا ئەو بیمە غزە چوزانی خەبەر    داری لینراوە وە یاخود دەفتەر

( پەند ) زانیاریو دانش بوپەروەردەی ئایینە ، نەوەك بو خواردنی جیهان

کی فروشتی دانش‌و پاریزو زوهد        خەرمەنی کوکردەوەو سووتا هەمووی

( پەند ) ئەو زانایەی ناپەرهیزگارە ، کویریکی مەشخەل‌دارە ( یهدی بە وهو لا یهتدی ) ریگەی پی‌دەرئەکریت ، بەلام خوی ریگە دەرناکات ( هونراو ) :

بی‌سوودە کەسی تەمەلی دوران        زەرکاری فیربوو هیچی نەکری

( پەند ) پادشا لە عاقلان جەمال وەرئەگریت‌و لە پاریزگاران ئایین‌و کەمال . پادشایان ئاموژگاری‌ی عاقلانیان پیویست‌ترە لە تیکەلی‌ی پادشایان بو عاقلان

( پارچە ) :

گەر هەیە پەندی بیبیی ئەی پادشا        لە هەموو نامە لی‌ی چاتر نی‌یە

کار بە عاقلان نەبی مەسپیرە        بەلام عاقلان کاریان بوچی‌یە ؟

( پەند ) سی‌شت پایەدار نامینی : مال بی بازرگانی . زانیاری بی‌گفتوگوکردن لی‌ی . مولك بی‌سیاسەت .

کاتی بە لوتف‌و نەرمی‌ی ووتارو بە پیاوەتی

دینیتە ژیر کەمەندی قوبوولت دلی یەکی

جاری بە قین سەیرکە کە سەدگوزە پر نەبات

جی‌ناگری لەبوت وەکو دەنکە گوژالکی

( پەند ) بەزەیی هاتنەوە بە خراپانا ستەمکاری‌یە بەسەر چاکانا . چاوپوشی لە ستەم کاران ستەم‌کاری‌یە بو هەژاران . ( تاك ) :

ئەگەر پیسی بکەی پەروەردە بیلاوینی وەکوو چاکان

بە مال‌و دەولەتی تووە ئەکا تاوانی بی‌پایان (۱)

---

(۱) ( نوسخە )

رەحمەت بە پلنگ کە تیژە دانی        ستەمە بو مەر ئەگەر بیزانی

( پەند ) پشت بە دوستی‌ی پادشایان‌و دەنگ‌خوشی‌ی منالان نابەستریت ، ئەو بە خەیالی ئەگوریت‌و ئەم بە خەویك ( شیعر )

دل بـە دلداری مەدە بیی هەزاران یاری‌تر
گەر دلت دایە لە ئەووەل روژەوە بو جیایی‌یە

( پەند ) ئەو نهینی‌یەی هەتە لای دوست مەیهینەرە ناو ، هەرچەند دوستیکی راستیش بی چونکە ئەویش دوستانی هەیەو هەروەها بە زەنجیرە ( پارچە ) :

بی‌دەنگ لـە رازی‌دلت چاکترە بلییت بە کەسی‌و بلی‌ی مەیکە باس
ئەی‌ساغ بیەستە ئاو لەسەر چاوە جوگە کە پر بوو نابەسریت کەساس

( تـاك )

ناشـی بو ووتن ووتار بـە پـەنهان کە نەشی بکری بو کومەل بەیان (۱)

( پەند ) دوژمنی لاواز دیتە ژیر فەرمانەوەو دوستی ئەنوینی . مەبەستی هەر ئەوەیە هەتا ئەبی بە دوژمنیکی بەهیز . بە دوستی‌ی دوستان پشت نابەستری هەتا بە دەلەچەی دوژمنان دلنیایی بی . هەر کەسە دوژمنی بچووکی لا سووك بی وەکو ئەوە وایە واز لە ئاگری کەم بینی . ( پارچە ) :

---

(۱) تو نیهانی‌ی خوت لەلای یارت مەلی بیزانە چاك
یارەکەت یاری هەیەو ئـەو یارە یاریکی هەیە
وە لـە نوسخەیەکدا : هیچ کەس بو رازی خوت لـــە خوت دلسوزتر نی‌یـە :
گیانی گەیی‌یە سەر دوو لیوی جا ووتی باوکی بە هوش
پەندی من بیی بە دوو گویی چاکە ئەی یاری عەزیز
دامـەدە رازت لـە بـو یـاری عەزیزت گیانەکەم
چونکـە ئـەو یارەت هەیەتی یارو دلداری عەزیز

ئیمرو ئەتوانی کپی کە ئاگر.. کە ئەسووتینی بەرز بی جیهان
ئەتوانی دوژمن بە تیر بدرویت مولەتی مەدە ژی خانە کەوان

(پەند) لە نیوانی دوو دوژمنا وا بدوی کە ئەگەر بوون بە دوست شەرمەسار نەبیت .

لە بەینی دووکەس شەر وەك ئاگرە ووتەچن بەدبەخت داریان بو دینی
رەنگە ئەم دوانە دل خوش‌بن بە یەك لەوناوە بەدبەخت رووزەرد ئەمینی
لە بەینی دووکەس ئاگر هەلگیرسان سزای تەنها بو فووکەر ئە نوینی

( پارچە )

لەگەل دوستانا بە هیواش بدوی تا گوی‌ی لی نەبی دوژمنی خوین‌خوار
لەلای دیوارا ئاگای دەمت بە نەوەك گوی بی لەو دیوی دیوار

( پەند ) کە لە جی‌بەجی کردنی ئیشیکا دوو دل کەوتی ئەوەیان بکە کە بەبی ئازارت پیك‌دی . ( ئاك ) :

لەگەلیا تو گران مەدوی کەسی ئەدوی کەوا ئاسان
لە قاپی‌ی ریکی‌دا هەرکەس بە شەر تو بوی مەچو مەیدان

( پەند ) ئیشی هەتا بە پارەپیك بیت ناشی گیانی بو بخەیتە ترسەوە . عەرەب ئەلی ( آخر الحیل السیف ) واتە : شیر لە پاش هەموو فیلیکەوەیە .

کە دەست بەربوو لە هەموو فیلی ئەوسا دروستە دەست‌بەری بو شیر

( پەند ) بەزەییت بە بی‌دەسەلاتی‌ی دوژمنانەیەتەوە ، چونکە ئەگەر دەسەلاتی‌بوو نات‌بەخشیت .

تو لی‌مەدە لافی هیز دیت دوژمنی خوت لاواز
پیاویکە لە هەر بەرگی موخیکە لە هەر ئیسقان

( پەند ) هەر کەسی بەدی بکوژی عالەمی لە بەلای ئەو رزگار ئەکاو ئەویش لە سزای خوای .

پەسەند بێزراوە بەخشایش لەلام مەیدە بە مەردوم ئازاری مەلحەم
نازانی ئەوەی رەحم ئەکا بەمار ستەمە ئەیکا بە نەوەی ئادەم

( پەند ) ئاموژگاری وەرگرتن لەدوژمن ، خەتایە . بەلام بیستنی رەوایە . کە بە پێچەوانەی ئەوە جوولایتەوە پێکاوتە . ( مەسنەوی ) :

پاریز ! کە دوژمن چی ئەلیت نەیکەی بە دوو دەست ئەدەی لە ئەژنوی زیان
تو لی ی لابدەو روو بکە دەستەچەپ گەر وەك تیری راست ریت بدا نیشان

( پەند ) قین لە سنوور دەرچوو سلی لی ئەکریت ، نەرمیی بی کاتو بی جی سامی پیاناهیلیت . نە ئەوەندە درشتی بکە کە لیت تیربین ، نە ئەوەندە نەرمی بنوینە کە بە سەرتا دلیربین . ( چەند شیعری ) :

درشتیو نەرمی چاکن جووت با هەم خوینگر دا ئەنی برینو مەلحەم
نایکا بە پیشە عاقل درشتی هەروەك قەدری خوی نابا بە سستی
لی نادا لاف گەورەو ئاغایی وەك لەشی نادا بە بینەوایی

( هونراوە )

گەنجی بە باوکی ووت ئەی خیرەدمەند ئادەی پیرانە تو بمدەری پەند
ووتی پیاوچاك بە نەك ئەوەند ئەی گیان

رل بی بە سەرتا گورگی تیژدان

( پەند ) دووکەس دوژمنی مولكو ئایینن : پادشای بی حیلمو خواپەرستی بی عیلم . ( هونراوە )

لەسەر مولك نەبی پادشای فەرماندەر کە خوی بو خودا نەبی فەرمانبەر

( پەند ) پادشا ئەبی تا سنووری بەسەر دوشمنا قین لی‌بخوری کە دوستانی دل‌نیایی‌یان پی بمینی . ئاگری قین لە پیشا لە خاوەن قین بەرئەبی ، جا یا ئەگاتە دوشمن یا نای‌گاتی . ( مەسنەوی )

ناشی ئادەمزاد کە تو لە خاکی لەسەر راگری توندی بی‌باکی
تو کە ئەوەندە توندو سەرکەشی وا بزانم خاك نیت تو لە ئاتەشی(۱)

( پارچە )

گەیمە خواپەرستی لە ناو شاری بیلەکان
پیم‌ووت بە تەربیەت لە جەهالەت دەبمکە پاك
فەرمووی بە چەشنی خاك تەحەممول کە ئەی فەقی
یا هەرچیکت کە خویندووە بینیرە ژیری خاك

( پەند ) بەدخو بە دەستی دوژمنی گرفتارە بو هەرجی‌یەك ئەچی لە چنگی سزای ئەو رزگاربوونی نی‌یە .

ئەگەر لە چنگی بەلا بەدخووی بگاتە سەما
لە چنگی خوویی بەدی خوی ئەمینی هەر لە سەما

( پەند ) کە دیت لە سوپای دوژمنا پەریشانی‌یەك هەیە ، تو خوت گرد کەرەوە. کە دیت گرد بووەتەوە تو لە پەریشانی بترسە .

لە خزمەت دوستان دانیشە بی‌غەم لە بەینی دوژمنانا دیت ئەگەر جەنگ
لەگەل یەکتر ئەگەر خو یەك زمان‌بوون
کەمان ژیی تی‌خە بو بن‌بەردو بن سەنگ

(۱) کە گەردن‌کەش‌بوو ئاگر ترسناك لەش خوی داخست بە بیچارە خاك
ئەو سەربەرزی‌ی‌کرد ، ئەم‌خوی گرت بە کەم
لەو دیو دروست‌بوو ، لەمی‌تر ئادەم

( پەند ) دوژمن کە لە هەموو فیلی داما ، زنجیری دوستایەتی‌ی رائەوەشینی . ئەوسا بە دوستی ئەو ئیشانە ئەکا کە هیچ دوژمنی نەی‌توانیی بیکات .

سەری مار بە دەستی دوژمن بکوتەرەوە ، لەوە بەدەر نی‌یە کە یەکیك لە دوو چاکەت دەسگیربی : ئەم زال‌بوو مارت کوشتووە . ئەو زال‌بوو لە دوژمن رزگاربوویت .

( تاك )

لە روژی شەر مەبە تو دلنیا لە دوژمنی لەر

دەسی لە گیانی کە شت میشکی شیرئەکا دەر

( پەند ) هەوالیکی دل‌ئازاردەرت بیست لی‌ی بی‌دەنگ بە ، با یەکی‌کی‌تر بیگەیەنی .

بولبول تو مژدەی بەهار بدە زوو     باسی بەد بدە دەس کوندەبەبوو

( ووردی ) پادشا لە خەیانەتی کەس ئاگادار مەکە مەگەر بە تەواوی باوەرت کردبی ، ئەگینا بو فەوتانی خوت تەقەلا ئەدەی . ( مەسنەوی )

ووتەت بیژە جا وەرە گوفتار     ئەبینی ووتەت ئەگیری لەکار

ووتار نیشانەی کەمالە بو پیاو     تو خوت بە ووتار بوچ ئەکەی بەدناو

ئەتەوی دادەی ئەگەر پەندی‌کەس     پەندی‌خوت دادە ئیتر بو تو و بەس

( پەند ) کەسی بە خو پەسەندی ئاموژگاری‌ی خەلکی ئەکات ئەوە خوی پیویستی بە ئاموژگاری دادەریك هەیە .

( پەند ) بە دوشمن تەفرە مەخوو سەرکەشی‌ی ستایش‌گو مەکرە . ئەم داوی رزقی ناوەتەوەو ئەو داوینی تەماعی گرتووەتەوە .

( پەند ) ئەحمەق ستایشی لاخوشە ، وەکو لاك لە لاقەوە فووی تی‌کەی

قەلەو ئەنوینی . ( پارچە ) :

وریا ! مەگرە گوێستایشی کەس     بە کەم سوودێکت ئەو هیواداره
ڕوژی مەبەستی نەهێنێتـــە جێ     دووسەد قات کەمیت ئەکا ژمـاره

( پەند ) خاوەنی ووتار هەتا کەسی ڕەخنـــەی لێ‌نەگرێت ووتاری ڕێك‌و
پێك نابێ .

مەبە بایی بو جوانیی گوفتاری خوت     بە چەپلەیی‌نادان‌و ئەفکاری خوت

( پەند ) هەموو کەس عەقڵی خوی لا بە کەماله ، وە منالی خوی لا بە جەمال .

جوو و موسوڵمانی کەوتنە مشت‌ومر     کەوتمە پێکەنین لـە مشت‌ومریان
موسوڵمان ئەیووت ئەگەر وا نەبی     بە جوولەکەیی دەرچم لە جیهان
جوو ئەیووت سویندم بە تەورات ئەخوم     وا نەبی وەك تو ببمە موسوڵمان
گەر لـە ڕووی زەمین عەقل نەمێنی     کەس بـە نەفامی خوی نابا گومان

( پەند ) دوو ئادەمزاد لەسەرخوانیـك ئەخون ، دوو سەگ لەسەر لاکـی
پێك‌نایەن . چاوچنوك بە جیهـانی برسی‌یەو بە نانی تێرئەبی دانشمەندان ووتوویانە
دەرویشی بە قەناعەت باشترە لە دەولەمەندی بە سامان ( تاك ) :

بە نانی پر ئەبی نانی بچووکی     پری ناکا جیهـانی چاوچنوکـی

( مەسنەوی )

کە باوکم دەوری عومری خوی بەسـەر برد
منی بەم جورە ئاموژگاری‌یەك کـرد
کە شەهوەت ئاگرە خوت بگرە لێی دوور
لەسەرخوت ئاگری دوزەخ مەکە سوور
لەناو ئەو ئاگرە نیتـــە تەوانا     دە ئیمرو ئاوی پیاکە مەردی دانا

( پەند ) هەرکەس لە حالی توانایی‌یا چاکە نەکات ، لـە کاتی نەتوانی‌یا سەختی ئەبینی . ( تاك ) :

بەدبەخت‌تر کوا لە مەردوم‌ئازار کەس روژی بەلا بوی نابی بە یار

( پەند ) ئەوی زوو بیت زور نامینیتەوە ( پارچە ) :

بیستوومە کەوا لـــە روژهەلاتا بە چل سـال ئەیکەن یەك‌کاسەی چینی
لە « مەر دەشت »[1] ئەکەن سەدی بە روژی
بویـــە قیمـــەتی وایـــە ئەیبینی

( پارچە )

لە هیلکە جووجەلە دەرچوو کوتووپر رزقی پبویستە
ســـەیر کە ئادەمی ئاگای لە عەقل‌و هوشی خوی نابی
لە ناکاو پیگەیی هەرکەس بزانە تو بە هیچ ناگات
بە فەزل‌و هیممەتە پەیدائەکات هەرچی لەدنیـا بی
لە هەرجی ئاوینە چونکە هەیە بی‌قەدر ئەنوینی
لەعل چونکە بە زەحمەت دیتەدەس ئازیزە تا ما بی

( پەند ) ئیش‌وکار بە پشوویەك پیك‌دیت‌و بە پەلە ئەچیتە سەر .

بە چاو دیم یەکی کە لە بیـابان . . ئاهیستە پیش‌کەوت کە لە خوش‌رەوان
زور ئەسپی رەسەن لە غار پەکی‌کەوت حوشترەوانان هیواش ئەیان‌ران

( پەند ) بو نادان هیچ شتیك لە بی‌دەنگی چاکتر نی‌یە . بـەلام ئەگەر ئەوەی بزانی‌بایە نادان نە ئەبوو . ( پارچە )

فەزل‌و کەمالت نی‌یە وا چاکە زمان لە دەمتـــا بکەی ئاگادار

---

(١) لە نوسخەیەکدا ـ نزیك شیراز دیزە دروست‌ئەکەن .

زمانە ئینسان کە رســـوا ئەکا گویزی‌پووت سووکە لە دەست‌و لە پار

( چەند شیعری )

شیتی ئەی ئاخاوت(١) کەری هەمیشە کوششی‌ئەکرد لی‌ی بووبوە پیشە

عـاقلی پی‌ی‌ووت نادانی نابووت بترسی چـاکە لە لومەو تانووت

ووتار فیرئەبی لە تو گیان لەبەر بیدەنگی فـیربە لیوەی نەبی کەر

( دووبارە )

وورد نەبیتەوە هەرکەس لە وەلام زووتر ووتاری ناگاتە ئەنجـام

ووتارت جوان‌کە وەك پیاوی بەهوش یا وەك بی‌زمان دانیشە خاموش

( پەند ) هەرکەسی لەگەل لە خوی داناتر بەربەرەکانی‌ی کرد بو ئەوە وا بزانن کە دانایە ، بزانن کە نادانە . ( تاك )

لە خوت داناتر کە هاتە ووتار با قەی بزانی‌ی(٢) لی مەخەرە کار

( پەند ) هەرکەس لەگەل بەدان دانیشی چاکی نابینی .

( چەند شیعری )

گەر لەگەل دیوا فریشتە دانیشت فیر ئەبی فیل‌و خەیانەت وەحشەت

فیرنابی مەگەر بەدی لە بەدان گورگ پیست دروون ناکاتە سەنعەت

( پارچە )

کەم هەنوشینی بەدبەو هاوری‌ی بەد زورپاك بیت پیست‌ئەکا براکیـان

سەرچاوەی روژی روون کە رووناکە توزی هەور دیت چون ئەیکا پەنهـان

( پەند ) عەیب‌و کەمی‌ی نیهان پەیدا مەکە بو کەسان ، هەتا ئەوان ریســـوا نەکەیت‌و خوت بی‌پشتیوان .

---

(١) فیری‌ئەکرد . (ع) . (٢) اعتراض .

( پەند ) هەرکەس فیری زانیاری‌بوو ، دەئیشی پی‌نەکرد وەك ئەوەیە جووت بەگا بکاو توو دانەچینی . لە لەشی بی‌دلەوە خواپەرستی پیك نایەت‌و پیستی بی ناوك بو مالی تیجارەت ناشی . نەوەکو هەرکەسی لە بەربەرەکانیدا چوستە ، لە مامەلەدا دروستە .

زور بالا جوانە لە ژیر چارشیوا   کە ئەیکەیتەوە دایکی دایکە وا

( پەند ) ئەگەر هەموو شەوی شەوی قەدر بوایە ، شەوی قەدر بی‌قەدر ئەبوو .

هەموو بەرد لەعلی بەدەخشان بوایە   ئەبوو قیمەت‌یان جا یەکسان بوایە

( پەند ) نەوەك هەرکەسی بە نیگار جوان‌و شیرینە ، بە رەوشت دروست‌و رەنگینە . ئیش لە ناو دەروونە نەوەك لە پیستایە . ( پارچە )

بە روژی رەنگە بناسی رەوشت‌و شیوەیی پیاو

هەتا چ پایەیی توانیویە فیر بی لە عولووم

بەلام نیهانی نیهانە ئەمین مەبەو سەرکەش

کە پیسی‌ی نەفسی بە چەند سالی نابی بوت مەعلووم

( پەند ) هەرکەسی چوو بە گژ گەورانا خوینی خوی ئەریژی . ( پارچە )

تو کە خوت وەها گەورە ئەزانی   راستە یەك بە دوو ئەبینی کە خیل

ناوچاوانت زوونەبینی ئەشکی   سەر لە دیوار دەی وەکو پیاوی گیل

( پەند ) لەگەل شیرا پەنجە لیدان‌و دەست بە شمشیرا کیشان ئیشی عاقلان نی‌یە . ( هونراوە )

زور ئاوەری‌و شەرمە کە لەگەل مەست   پەنجە لە باخەل بنی‌ی نەوەك دەست

( پەند ) بی‌هیز لەگەل بە هیزا دلاوەری بکا ، دوژمن دوستیکە لە فەوتانی خویا . ( پارچە )

سایە پەروەر لە کوێی هەیە توانا بێ هەمتا لە هاتو چوبی جەنگا
سست بازوو نەزانە پەنجە بدا کە لەگەل مەردی ئاسنین چنگا

( پەند ) هەرکەسی ئاموژگاری لەگوی نەگریت هەوای بیستنی تانووتی هەیە .
( تاك )

پەند لە گوی نەگری تو کە بەم رەنگە لـــە کاتی تانووت چارە بیدەنگە

( پەند ) بیعەقلان توانای بینینی عاقلانیان نییە ، هەروەکو سەگی کولانی بو سەگی راوی . خەریکی بە ئیشەوە ئەکەن بە بیانوو ناچنە پیشەوە . یانی کاتی سپلە بە هونەر دەرەقەتی کەسی نەهات ، بە پیسی ئەچیتە پیستیەوە خراپی ئەلی . (تاك)

غەیبەت دەرئەخا حەسوودی دەس کول زمانی ووتەی کە لە روو بوو کول

( پەند ) ئەگەر ستەمی سك نەبوایە هیچ بالندەیەك نەئەکەوتە دووی راوچی ، وە راوچییش داوی دانەئەنا . ( تاك )

سکە زنجیری بەند بو قاچو دەست نایاب بەندی سك ئەبی خواپەرست

هەر شینپوشی سوفی نییەو هەر سوفییەك ســـافی نییە . لە هەموو پیستیکا دوست نییە . ( تاك )

مەزانە دیوی پەنهانیش وەکوو دیوی دەری وایە
گەلی حەلوایی سابوونی هەیە زەهری لەناوایە

( پەند ) دانشمەندان درەنگ درەنگ ئەخونو خواپەرستان نیوە تیر ، وە زاهیدان مەمرەو مەژی ، سەددی رەمەق ، گەنجـان تا بگری تەبەق و ، پیران هەتا ئەکەن عەرەق . بەلام رەندان ئەوەندە ئەخون هەتا ریگەی هەناسـەیان بمینی ، وە لەسەر خوان مووچە بو کەس . ( هونراو )

دیلی سك دوو شەو بیخەوە رەنگە شەوی مەعدە قورس شەوی دلتەنگە

( پەند ) راوێژکاری لەگەل ژنا بەربادەو ، بەخشایش لـەگەل خاوەن فەسادە گوناهە . ( تاك ) :

ئەگەر پیسی بکەی پەروەردە بیلاوینی وەك چاکان

بە مالو دەولەتی تووە ئەکا بیدینی بیپایان (١)

( پەند ) هەرکەسی دوژمن لەبەردەسیایەتی‌و نایکوژی ئەوە دوژمنی خویەتی . ( تاك )

بەرد لە دەستا بیو لەسەر بەردبی مار سستی‌یە دوای‌خەی بیربخەیتە کار

دەستەیەك پیچەوانەی ئەمەیان بە ریك‌دیوە ، ووتوویانە لـە کوشتنی بەندی‌یانا ووردبوونەوە چانرە لەبەر ئەوە کە دەسەلات لـە دەستی خوتایە ، ئەتوانی بیکوژی‌و ئەتوانی نەیکوژی . ئەگەر بیووردبوونەوە بکوژریت رەنگە کاریکی لە دەست بچی ، وە بەجی‌هینانەوەی شتی‌وا نایەتەوە ( مەسنەوی )

چاكو ئاسانە زیندووکەی بیگیان کوشتوو ناتوانی زیندووکەیتەوە

خو مەرجی عەقلە هیواش تیرباوی لـە کەوان دەرچوو ناگەریتەوە

( پەند ) دانشـمەندی لەتەك نەفاما هەرای‌کرد ئەبی بە تەمای عیزەت‌و حورمەت نەبی . نەفامی بیتە زمان بەسەر دانشمەندیکا زال ئەبی . ئەوە هیچ سەیر نی‌یە چونکە بەرد گەوهەر ئەشکینی . ( تاك )

سەیر نی‌یە ئەگەر بوی نەدری نەفەس بولبول لە تەك قەل بکری هاو قەفەس

( پارچە )

هونەرمەند کە دی لە خویری جەفا هەتا تیك نەچی دل پر لـە ئازار

بەردی بەد کاسەی زیرین ئەشکینی نرخی زیـاد نابی‌و زەر کەم پی‌زار

( پەند ) دانشمەند ئەگەر لەناو هەرزەدا ووتاری بەست سەرسام مەبە ، چونکە

---

(١) ئەم بەیتە لەمەوبەر ووتراوە .

ئاوازی بوربوت لەگەل دەنگی دەهول پیك نایەت ، وە بوگەنی عەبیر لە بوگەنستانا پەکی ئەکەویت ( مەسنەوی ) :

گەردنی قوت کرد دەنگ زلی نادان  کە بەبی شەرمی دانای دانەوان
نازانی کەوا سوزی حیجازی  خو دوائەکەویت لە تەپلی غازی (۱)

( پەند ) گەوهەر ئەگەر بشکەویتە ئاوەدەس خانەوە هەروا بـــە نرخە . توز ئەگەر بش گاتە ئاسمان هەروا سووك و بی نرخە . پەروەردە نەکردنی لی هاتوو جیگەی داخە وە پەروەردەکردنی لی نەهاتوو فەوتاوە . خولەمیش بە شتیکی بەرزەوە پەیوەندی هەیە چونکە ئاگر جەوهەری بالایە بەلام خوی چونکە هونەریکی تیـانی یە لەگەل خاکا یەکسانەو نرخی شەکر لەبەر ئەوە نی یە لە قامیشە ، بەلکە تایبەتی هی خویەتی . سەگی کاروانی لی ئەخوریت و گورگیك ئەرەوینی .

پیاوی لە هونەر کە بوو بەهرەوەر  هونەر خوی ئەیلیت نەوەك هونەروەر
( مەسنەوی )
سروشتی بی هونەربوو خوی کە کەنعان  پەیامبەرزادەیی نەیکرد بە سەروەر
هونەر بنوینە نەك گەوهەر براگیـان  کە گول هی درکە ئیبراهیم لە ئـازەر

( پەند ) میسك ئەوەیە خوی بونی بیت ، نەوەك عەتار بیلیت . زانا وەکو قوتووی عەتار بی دەنگەو هونەر دەرخەر . نەزانی وەك تەپلی غـازی وایە دەنگ بەرزو ناوبەتال . ( پارچە )

عالمی لـــەناو کومەلی نەزان  وینەیان وەهـا ووتوە راستگویان
وەکو قورئانی کەنشتەی زەندیق  یاوەك دولبەری لە کوری کویران

( پەند ) دوستی کە بە عومری دەست ئەکەوی ، بە هەناسەیەك نابی ئازار بدریت ( هونراوە )

---

(۱) دەهول شەرە

چەند ســـالی پی ئەوی بەرد بی بە پارچە لەعلی

زینهـار بە یەك‌هەناسە نەیشکێنی تو بە بەردی

( پەند ) عەقل لە دەست نەفسا گرفتارە وەکو پیـاوی بی‌هیز کە لە دەس ژن ئەکاگوریز . ( هونراوە ) :

دەری خوشی‌داخە لە مالی کە ژن    بکا دەنگ‌و ئاوازی تیدا بلنـــد

( پەند ) بریاری بی‌هیز فروفیلەو ئەفسوون . هیزی بی‌بریار نەزانینەو شیتی‌و جنون .

تەمیزی پی‌ئەوی راویژو عەقل ئەنجا مولك

کە مولك‌و دەولەتی نادان چەکی شەرە بو خوا

جوانمەردی کە بخواو بیەخشی چاکترە لـە خواپەرستی کە وەرگریت‌و نەبەخشی . هەرکەسی لە زیندوویی‌یا نـانی نەخون . لـە مردوویی‌یا ناوی نابەن . خوشی‌ی تری بیوەژن ئەیزانی نەوەك خاوەن‌تری .

( پەند ) هەرکەسی بو ئەوەی لای خەلك قوبوول بی واز لە ئارەزوو بینی ئەوە لە ئارەزووی حەلالەوە کەوتووەتە ئارەزووی حەرامەوە .

بو خوا عابید گەر گوشەنەگری    ئاوینەی تاریك چی تیا ئەبینری

( پەند ) کەم‌کەم ئەبی بە زور . دلوپ دلوپ بە لیشـــاو . یـانی کەسی کە دەستی هیزی نەبی بەردی وورد ئاگاداری ئەکا تا کانی هەل ئەوسا میشکی دوژمنی دەردەهینی . ( شیعر )

قطر علی قطر اذا اتفقت نهر    نهر علی نهر اذا اجتمعت بحر

دلوپ دلوپ بە یەك‌بوون ئەبیتە جوگابە    گردبووە جوگە جوگە ئەبیتە دەلیابە

( تاك )

کەم‌کەم کوبووەوە زور ئەدادیار    دەنکە دەنکە دەغل ئەبیتە عەمار

(پەند) دانشمەند نابی بی‌هوشی‌ی نەفامان بە حیلم‌و توانایی رابویرینی، چونکە هەردوولا زیان‌ئەکەن. ئەو سامی نامینی‌و نەزانی‌ی ئەم دەمار دای‌ئەکوتی.

(هونراوە):

لەگەل سپلە بدوی‌یت بە نەرمی‌و خوشی

زیاتر ئەکا دەعیـــە گەردن‌کەشی (۱)

(پەند) گوناه لە هەرکەس دەرکەوی ناپەسەندە، لە زانایان دەرکەوی ناخوشترە، چونکە زانیاری چەکی جەنگی شەیتانە، وە خاوەن چەك کاتی بە دیلی بیبەن زورتر شەرمەزاری ئەکیشی. (مەسنەوی)

نەزانی نەزان پەریشان روژان چاکە نەك زانای پاریزنەکەران

ئەو نابینایە لە ری کەوتەپال دوو چاوی هەیە ئەم بو کەوتەچال

(پەند) گیان لە سایەی یەك‌هەناسەدایە. جیهان بوونە لە نیوانی دوونەبوونا. ئەوانەی ئایین ئەفروشن بە جیهان کەرن یوسف ئەفروشن بو ئەوەی چی پی‌بکرن؟ (ألم اعهد اليكم يابني آدم ان لا تعبدوا الشيطان ؟) خوا ئەفەرموویت ئایا پەیمانم لی‌وەرنەگرتن ئەی بەنی‌ئادەم کەوا شەیتان مەپەرستن (انه لكم عدو مبين) بی‌گومان شەیتان دوژمنیکی ئاشکرای ئیوەیە.

بە وانەی دوژمنان بشکینە تو، لەگەل یاراندا پەیمان

ببینە کی ئەبیتە یارت‌و دلی کیشت لە خوت رەنجان (۲).

(پەند) (۳) شەیتان دەرەقەتی راستان نایەو پادشا دەرەقەتی نابووتان‌نایەت.

---

(۱) هەر کوی حەز ئەکەی فەرموو داخی‌کە مەلحەم تو بیکەی بیسوودو کەلکە

(۲) ئەم دیرە لە دەستنووسە کەدا نەبوو، بەم جورە کردم بە کوردی (ع)

(۳) نوسخە:

ما فات مضى وما سيأتيك قم فأغتنم الفرصة بين العدمين

یارمە فروشە بە دنیا کە کەلی سوودی نەکرد

بە زەری ناسرە هەرکەس کە فروشتی یوسف

( مەسنەوی )

قەرز مەدە بەوەی کە نویژنەکەری ‌ ‌ ‌ با لـــە هەژاری ئاوانەکا دەم
ئـەو قەرزی خـوا نەهێنیتە جی ‌ ‌ ‌ دلی بو قەرزی تو چون ئەخوا خەم

( ئاك ) دووکەسی ئیمرو لەبەر دەمدایە بوی پیوانەکەن
بو سبەینی پیت ئەلی ئا لیرە توری هەل‌کەنە

( پەند ) یوسفی سدیق سەلامی‌خوای‌لی‌بی لە ووشکە سـالیکا تیری نەئەخوارد هەتا برسی‌یان فەراموش‌نەکات . ( مەسنەوی )

لە خوشی‌و راحەت کەسی ژیابی ‌ ‌ ‌ لە حـالی برسی ئەبی چی لابی
کەسی ئەزانی حـالی داماوان ‌ ‌ ‌ دامـاوی‌ی دبی روژانی ژیان

( پارچە ) ئەی کە سواری ئەسپی چاکی ئاگەدار بە لەو کەسە
وا ذرك‌کیش‌و سووتاوە رو چووی ئاوو گلە
ئاگری مالی دراوسی‌کەت مەخوازە تی‌بکە
لەو کلاوروژنە ئەوەی وا دیتەدەر دوودی دلە

( پەند ) لـە ووشك‌سالی‌یا لە دەرویشی کەم‌حال مەپرسە چونی ؟ مەگەر بـەو مەرحە لە برینی مەلحەمی داینیت‌و شتیکی دیاری بدەیتی . ( پارچە )

کە دیتت‌کەرو باری لـە قـورا ‌ ‌ ‌ رەحمی پی‌بکـە مەرو بە سەرا
ئیستا کە پرسیت چون کەوت بیەستە ‌ ‌ ‌ پیـاوانەپشتین ، کلکی‌گرە خـــیرا

( پەند ) دووشت لەگەل عەقلا ناریکـە : خواردنی زیاد لە مووچەی بەش‌کراوو ، مردن لە پیش ئاکامی دیاری‌کراو

قـەزا ئاگوری هەزار نالـەو ئاە ‌ ‌ ‌ بە شوکرو شکات ئەر لە دەم دەری
فریشتەی مەئموور لەسەر گەنجی‌با ‌ ‌ ‌ چ‌غەمیـــە چرای پیرەژن بمری

( پەند ) ئەی هەواخواهی مووچەوو رزق دانیشە هەتا بیخویت . ئەی

داواکراوی ناکام مەرو گیان دەرنابەیت (پارچە) :

هەولی مووچە بدەی وە یا نەیدەی ئـەیگەیینی خودای عەززەوەجـەل
گەر بچیتـە دەمی پلنگ‌و شـیر خو تو ناخون مەگەر لە روژی ئەجەل

(پەند) دەولەمەندی فاسق گلمتکی رووکەشی ئالتوونە . هەژاری پیاوچـاك دولیەری خولاویی‌یە . ئەمیان غەرقیەی پینـاوی مووسایە ، ئەویان ریشی مرواری تی‌خراوی فیرعەونە . سەختی‌ی پیاوچاکان روو لـە خوشی‌یە ، وە دەولەتی بەدان سەر لەنزمی‌یە . (پارچە)

بزانە ئەوەی پایـــەو دەولەتی هەیەو بو دامـاو ناگاتە فریـــا
بلی پی‌ی کە هیچ دەولەت‌و حورمەت دەسی ناکەویت کە لەوەدنیـــا

دانەنراو دەستی پی‌ناگا ، دانراو لە هەر جی‌بی بی دەستی ئەگاتی (تاك) :

بیستت ئەسکەندەر گەییە تاریکی کی‌ی‌تر خواردیەوە لی‌ی ئاوی ژیان

راوچی‌ی بی‌روژی لـە دەجلە ماسی‌ناگری ، وە ماسی‌ی بی‌ناکام لە ووشکی‌یا نامری . (تاك) :

چنوکی هەژار عالــــەم ئەگەری لە دوای مووچەو ناکام لـە دوای ئەو

(پەند) حەسوود هەروەکو لە بەخشایش‌و نیعمەتی خـوا چرووکی ئەکات ، هەروا دوشمنی پیاوی بی‌گوناهیشە . (پارچە)

جاریك پیاویکی ووشکە مەغزەدی کەوتبوە سەرو پیستی خاوەن جاه
ووتم ماموستا تو خوت بەدبەختی پیاوی خاوەن بەخت چی‌هەیەگوناه

(پارچە)

ها داوا نەکەی بەلا بو حەسورد ئـەو خوی هەمیشە وا بـە بەلاوە
هیچ پیویست نی‌یە دوشمنی بکەیت ئەو خوی دوشمنی خوی وا بـە دواوە

(پەند) شاگردی بی‌ئارەزوو عاشقی بیزەرە . ریبواری بی‌مەعریفەت بالندەی

بی‌بال‌و پەرە . زانای بی‌کردەوە داری بی‌بەرە . زاهیدی نەزان خانووی بی‌قاپی‌و دەرە . مەبەست لـــە هاتنی قورئان پەیداکردنی رەوشتی جوانە ، نەوەك هـــەر خویندنەوەی شیوەی نووسراوی . خواپەرستی نەزان ری‌رەوی پیـادەیە زانای کردار سست سواریکی نووستووە . گوناەکاری دەست‌هەل‌گر چاترە لە خواپەرستی هەوا لەسەر . ( تاك ) :

چاترە سەرهەنگ خوش‌خوو دلداربی لـــە زانای شەرعی مەردوم ئازاربی

( ووتە ) بە یەکیکیان ووت زانای بی‌کردە لە چی ئەچی ؟ ووتی لە زەردەوالەی بی هەنگوین ( تاك ) :

بـــە زەردەوالەی بی‌مرووەت بلی هەنگوینت نی‌یە پیوەدان بەس‌بی

( ووتە ) پیاوی بی‌مرووەت ژنە . خواپەرستی بە تەماع ری‌گرە . ( پارچە ) :

ئەی بە فیل‌کردت کراست سپی بو باوەری خەلك نامەت کرت سیـا
داوین‌دریژو ڪورتی یەکسـانە پیویستە دەستت کورت‌کەی لە دنیا

( پەند ) دوو کەس داخ لـە دلیان دەرناچی‌و پی‌ی زیانیان لە قور دەرناچی بازرگانی کەشتی شکاوو ، میرات دەست‌کەوتووی هەم‌نوشینی رەندان . ( پارچە ) :

خوینت حەلالە لە لای دەرویشان گەر نەکەی مـالت لە ناویان سەبیل
یا مەبە هاوری بو کراس‌شینان یا بو خـانوومان دانی پەنجەی نیـل
یا دوستی مـــەکە بو فیلەوانان یا خانوو بڪە بە ئەندازەی فیل

( پەند ) خەلاتی پاشا ئەگەرچی خوشەویستە ، کراسن دراوی خوت لەو بـە حورمەت‌ترە . خوانی گەورەپیاوان ئەگەر چی خوشە ، قاوتی هەمانەی خوت خوشترە . ( تاك ) :

لە دەس رەنجی خوت سرکەی‌تەر خواردن
نەك نانی کویخاو دەس بە سنگ گرتن

( پەند ) ناریکی راستیو پیچەوانەی بریاری خاوەن عەقلانە بەگومان دەرمان خواردنو بیکاروان بە نەشارەزایی بە ریدا رویشتن . لە غەزالیی پیشەوایان پرسی ـ رەحمە تیخوای لیبی ـ بە چی تو گەیشتیتە ئەم پایەیە لە زانیارییا ؟ فەرمووی بەوە کە هەرچیم نە ئەزانی لە پرسینی عارو نەنگم نەبوو . ( پارچە ) :

ریکی عەقل ئەبی هیوای لەش ساغیت　　بە سروشت ناسی ئەبزت دەی نیشـان
پرسـە نەتزانی پرسکردن کەمی　　نیشانە بو ریی عیلمو عیززو شـان

( پەند ) هەرچی ئەزانی بوت دەرئەکەوی پەلە لەپرسینی مەکە ، بو دەسەلاتو سام زیانی هەیە ( پارچە ) :

لوقمان سەیریکرد وا لە دەســـت داوود
بە ئیعجاز ئاسن نەرم ئەبی وەك موم
نەیپرسی چیئەکەی چونکە ئەیزانی　　کە بەبی پرسین بوی ئەبی مەعلووم

یەکی لە پیویستی هاورییەتی ئەوەیە یا خانوو دروستکەیت یا لە تەك خاوەن خانووا بسازییت ( پارچە ) :

بدوی بە ریکی زەوقی گویگرت　　ئەگەر ئەتەوی لای بی مــــەیلی
هەرکەسی دانیشت لەگەل مەجنوونا　　نابی هیچ بـلی مـــەر ناوی لـەیلی

( ووتە ) هەرکەس لەگەل بەداندانیشی ، ئەگەر سروشتی ئەوان نەگری بـــە شیوەی ئەوان گومانی پیئەبری . ( مەسنەوی ) :

خەتی نەفامیت لەسەر رووتکیشا　　هاوریی نەفامت بو خوت راکیشا
لە دانایەکم داواکرد پەندی　　فەرمووی بـە نادان نەتبی پەیوەندی
پیی ئەبی بەکەر ئەبی ئەگەر نەزان بی　　زورتر کەر ئەبی ئەگەر دانای زەمانبی

( پەند ) تواناو حیلمی حوشتر دیارە ، ئەگەر منالی هەوسار بگری ســـەد

فرسەنگ ریگە ببیات سەر لە پەیرەوی ناپیچیتەوە . بەلام ئەگەر دەرەیەکی بـــە سـامی هاتـە پیش کە هوی فەوتانبی ، با منـــال بە نەفامی بیەوی ببـا بەریوە هەوسـاری لە دەست ئەپچری‌و ئیتر فەرمان‌بەرداری ناکات . لە کاتی درشـــتی‌یا نەرمی‌کردن ناشیرینە . ئەلین دوشمن بە نەرمی نابی بە دوست ، بەلکە تەمـای دوژمنایەتی زیاد ئەکات . ( پارچە ) :

کەسی کە نەرم‌و بە لوتفە بیە بە خاکی پی‌ی
ئەگەر ئەخاتەروو ناکوکی چاوی پر کە لە خاك

بە لوتف‌و نەرمی مەرو تو لەنەك درشت‌خوودا
بە بی‌ئەمانن ، ئەبەد ژەنگ خورد نابی پاك

( پەند ) هەرکەس خوی بخاتە بەرهەلستی ووتاری خەلکەوە هەتا فەزلی بزانن پایەی نەزانی‌ی ئەناسن .

پیاوی بـــە هوش بی نایەتە وەلام | مەگەر لـە کاتی لی‌ی بکەن سوئال . .
گەرچی سروشتی ووتەی راستی‌بی | لای خەلك ئەنوینی وەك داوای مەحال

( پەند ) لە ژیرکراسەوە برینیکم هەبوو ، شیخ رەحمەتی خوای‌لی‌بی هەموو روژی ئەی‌پرسی چونە ؟ نەی‌ئەپرسی لـــە کوی‌دایە ؟ زانیم لەناوبردنی خوی ئەپاریزی . چونکە ناوبردنی هەموو ئەندام رەوا نی‌یە خیرەدمەندان ووتوویانە هەرکەس ووتەی کیشانە نەکات لە وەلامی ئەرەنجی .

هەتا نەزانی ووتارت راســـتە | دەم‌مەکەرەوە پی‌ی بیتە گوفتـار
بە راستی بدویت لـە بەند بمینی | نەوەك بە درو لە بەند بی رزگار

( پەند ) دروکردن وەك برینیکی گەورەیە ئەگەر چـاکیش‌بیتەوە ، نیشانەی هەر ئەمینی . نابینی براکانی یوسف سەلامی خوای لەسەر بـە درویەك نیشانە کران

باوەر بە راستیان نەما ( قال بل سولت لکم انفسکم امرا ) باوکیان پیی ووتن راستناکەن بەلکو نەفستان درویی بو رازاندنەوە . . ( پارچە )

کەسی کە راستی بوو بە رەوشتی  هەلەیەك بکا لیی‌ئەکەن تیپەر
وە گەر بە درو ناوی کەوتە ناو  گەر راستیش بکا پیی‌ناکەن باوەر

( پەند ) گەورەترینی کائینات بە دیمەن ئادەمیزادە ، وە بینەواترین‌و سووك ـ ترینی هەرچی هەیە ، سەگە . بە بریاری هەموو عاقلان سەگیکی ماف ناس چاکترە لە ئادەمزادی ناسوپاس .

سەگی یەك پارووی ناکا فەراموش
بە بەرد لیی دەی ئەگەر سەد جار هونەوەر
وەگەر سپلە بلاوینی لە عومری  بە کەمترشت لەگەلتا دیتە سەرشەر

( پەند ) هونەروەری لە نەفس‌پەروەر روونادا‌و بی‌هونەر نابی بە سەروەر .
( مەسنەوەی )

تو رەحم مەکە بە پیاوی زورخوار  زورخوارو سووکە، گەلی سووك‌و خوار
ئەتەوی وەك گا ئەگەر قەلەو بی  بو خەلکان وەك کەر لەشت دە ئازار

( پەند ) لە ئینجیلا نووسراوە ئەی نەوەی ئادەم سامانت بدەمی بە مالەوە خەریك ئەبی لە من ، وە ئەگەر هەژارت‌بکەم بە تەنگ دلی دائەنیشی ، جا شیرینیی ناوی منت کەی دەس‌ئەکەوی‌و بە خواپەرستی ئەگەیت ؟ ( پارچە ) :

بە سامان سەرکەش خەریك بمینی  دلت تەنگ بی کاتی بیت هەژار
خوشی‌و ناخوشیی حالت وەهابی  کەی خەریك‌ئەبی بو پەروەردگار

( پەند ) ئارەزووی خوای بیچووں (1) یەکی لە تەختی پاشایی دینیتە خواری‌و

---

(1) بی‌هاوتا (ع)

یەکی لە ناو سکی ماسی‌یا ئاگاداری ئەکات . ( ئاك ) :

خوشە ناوی خوات بیتە موونیس    با لە ناو سکی ماسی وەك یونس

( پەند ) ئەگەر تیغی قین راکیشی پیغەمبەرو وەلی سەر دائەنەوینن ، وە ئەگەر لوتف‌و نەرمی بجوولینی خراپان بە چاکان ئەگەینی . ( پارچە ) :

گەر لە حەشرا بە قینەوە بدوی    ئەنبیـــا ناتەوانی مـــەعزەرەتە
سا لـە رووی لوتفی پـەردە بالادا    ئەشقیـا چاوەروانی مەغفیرەتـــە

( پەند ) هەرکەس بە بەلای جیهانی ریگەی راستی نەگریت دواروژ دوچاری ســــزا ئەبیت ( ولنذيقنهم من العذاب الادنى دون العذاب الاكبر ) واتـە خوا فەرموویەتی : سزای کەمی جیهانیان پی‌ئەچیژم ، نەوەك سزای گەورە ، بەلکو وریا بینەوە . ( ئاك ) :

گەورە لە پیش‌بەند بوت دائەنی پەند    کە پەندت نەبیست بوت دائەنی بەند

( پەند ) چاك‌بەختان بـە چیروك‌و پەندی پیشینەکان پەند وەرئەگرن لـە پیش ئەوەدا دوای ئەوان بە وینەی ئەوان دوچـاربین . دزان دەست کورت ناکەنەوە هەتا دەستیان کورت نەکەنەوە . ( پارچە ) :

مەل نزیك نابی بە دانە کە دی    وا مەلانی‌تر کەوتوونە ناو بەند
تو وەرگرە پەنـد لەدەردی کەســان    کەسان وەرنەگرن با لە تووە پەند

( پەند ) کەسی گوی‌ی ئارەزووی گران سروشت‌کراوە چی‌بکا بو ئەوە گوی‌ی لە شت‌بی . ئەوەی کەمەندی کامەرانی‌ی براوە چی‌بکات کە لە دەســـتی دەرنەچی ( پارچە ) :

لە شەوی تاریك دوستانی خوا    بویان ئەتریقی روژی دەرخشــان
بە زوری بازوو سەعادەت نابی    هەتا نەی‌بەخشی خوای میهرەبان

( چواری )

ناللم هەر بو تو هەر ئەتوی داوەر     لە ژووردەستی تو کوا دەست بالاتر
وون نابی کەسی تو ری‌ی دەی نیشان     ئەوەی وونت‌کرد نی‌یەتی رابەر

( پەند ) گەدایەکی چاك ئەنجام چاکترە لە پادشایەکی ناپیروز ( تاك )

غەمی پیش شادی گەلی چاترە     لە شادمانی غەمی لە دوا بی

( پەند ) ئاسمان بو زەمین شاباش ئەنیریت ، زەمین بو ئاسمان توزوخول .
( کل اناء یترشح بما فیه ) هە جامی چی تیایە بەوە پرشك ئەهاویژی . ( تاك )

گەر خوو رەوشتی من لەلات بەدە     تو خووی چاکی خوت لە دەس بەرمەدە

( پەند ) خوای بەرزی پیروز شتئەبینی‌و ئەی‌پوشی . دراوسی نای بینی‌و ئەیخاتە خروش . ( تاك )

پەنا بە خوا کە خەلك غەیبیان ئەزانی
لە حالی خوی نەئەسروەت کەس لە دەس کەس

( پەند ) لە کانا زەر بە هەلکەندن دیتەدەر ، وە لە دەستی چرووك بە گیان کەندن . ( پارچە ) :

دوونان ناخون‌و گوی قولاغ ئەلین     هیوا چاترە لە شتی خواردوو
روژی ئەبینی بە کامی دوژمن     داماو خاکسار کەوتوون مردوو

( پەند ) هەرکەسی ژیردەستان نەبەخشی بە جەوری زەبەردەستان دوچار ئەبیت ( مەسنەوی ) :

نەك هەر بازوویەك زوربکی هەبی     بە مەردی بی‌هیز کە تیك‌ئەشکینی
مەدە ئازاری دلی لاوازان     ئەبی داماوی زەبری زورمەندی

( چیروك ) دەرویشی بە پارانەوە ئەی‌ووت ئەی پەروەردگار بە خراپان رەحم

بکه که به چاکان رەحمت کردووه که به چاك دروستت کردوون .

( پەند ) قومارچی سی شەشی ئەوی ، بەلام سی یەك دینی .

( پەند ) عاقل که تاریکی هاته ناو کوشش ئەکا ، وه که ریکی چاو پی کەوت لەنگەر ئەهاوی . لەو جی یه سەلامەتی زوره ، وه لەم جی یه شیرینی لەناوایه .

( تاك ) :

عاقل روژی وا ئەچیته کەنار یاخوهەل ئەسی دەرئەچی له شار

( تاك ) :

لەوەری چاتر له مەیدان هەزار ئەسپ لەغاوی خوی کوا له دەستا

( چیروك ) یەکەم کەس که ئالای هەل کردو ئەنگوستیلەی لـه دەستی چەپ کرد جەمشید بوو . پی یان ووت بوچی جوانیت دا بـه چەپ ، فەزیلەت بو راست راسته ؟ ووتی راست ، جوانی ی راستی بو ئەو تەواوه ( پارچه )

به نەققاشانی چینی ووت فەرەیدوون که بو کەرگەل کوپانی جوانی بدروون
بەدان چاك راگره ئەی مەردی هوشیار که چاکان گەورەن و پیروز کردار

( پەند ) له گەورەیه کیان پرسی لەگەل ئەم هەموو فەزله دەستی راست هەیەتی، بوچی ئەنگوستیله ئەکەنه دەستی چەپ ؟ ووتی : نازانی که خاون هەمیشه بی بەشه .

( تاك ) :

ئەوەی کردوویه بەخت و روژی سەخت یا فـەزل ئەدا وەیاخود بەخت

( پەند ) ئاموژگاری ی پاشایان بو کەسی دەستەئەدا ترسی نەبی لەسەرو ، هیوای نەبی به زەر . ( مەسنەوی ) :

لەبەر پی ی خواناس بریژی که زەر وه شمشیری هیندیشی دانی ی لەسـەر
هیواو هەراسی نی یه خو له کەس وەهایه که بونیادی تەوحیدو بەس

( پەند ) پاشـا بو نەهیشتنی ستەمکارانه وه چاودیران بو خوین خواران ، وه

قازی هەواخواهی فیلبازانە . هەرگیز دوو دوشـــمنی بە حەق رازی ناچن بولای قازی . ( چواری ) :

ئەزانی کە حەق کی وەری‌ئەگری     نەرمی چاکە نەك جەنگ‌و دل‌تەنگی
خەرجی‌ی خوت نەدەی بە خوشی‌و بە زور
ئەیســـینی لەگەل زیادە ســـەرهەنگی

( پەند ) هەمووکەس دانی بە ترشی هەل‌ئەکەنریت ، قازی نەبی بە شیرینی .

( تاك ) :

گەر بەرتیل بخوا قازی پینج‌خەیار     دە بیستان کالەك بوت ئەدا بریار

قەحبەی‌پیر لە بی‌ئیشی تەوبە نەکات چی‌ئەکات ؟ وە کاربەدەستی لەکار لابراو لە مەردوم‌ئازاری ( تاك ) :

جەوانی گوشەنشین شیرمەردی ری‌ی خوایە
کە پیربوو بی دەسەلاتە لە گوشەیەك هەلسی

( تاك ) :

لەسەرگەنجان چسەختە خوی لە شەهوەت گەر بپاریزی
کە پیری بی‌هەوەس خوی ئالەتی ناجوولی هەل‌ناسی

( پەند ) لە دانشمەندیکیان پرسی ئەم هەموو درەختە کە خوای گەورەو بە دەسەلات ئافەریدەی فەرموون بە هیچیان نالین‌ئازادە بە سەرو نەبی کە هیچ بەریشی نی‌یە . تو بلییت لەوەدا حیکمەتیك هەبی ؟ ووتی : هەر یەکیکیان بەریکی دیاری‌ی هەیەو کاتیکی ئاشکرا کە تاوی بە بوونیان تازەن وە گاهی بە نەبوونیـان پەژموردە ، سەرو نەبی کە هیچی لەوانە نی‌یە ، وە هەموو کاتیکی خوشە ، وە ئەمەیە رەوشتی ئازادەگان . ( پارچە ) :

بەوەی کە تیپەرئەکا دلمەدە کە دەجلە گەلی
لە دوای خەلیفە کە دیت‌و ئەچی لە ناو بەغداد

لە دەستت دی وەکو خورما بەخاوەنی بەخشش
لە دەستت گەر نەیە جا وەك سەرو بە تو ئازاد

( پەند ) دووکەس مردنو داخیان‌برد . یــەکی ئەوەی بووی‌و نەیخوارد ، دووەم ئەوەی زانی‌و نەی‌کرد .

کەسی نەی دیوە چرووکی فازل    لە کەمی‌و کووری‌ی خوی تی‌نەکوشی
گەر خاوەن بەخشش دووسەد گوناەکا    بەخششی عـەیبی گشت دائەپوشی

نامەی گولستان تەواوبوو ، هەر خوا داوای یاریدەی لی‌کراوە بە دەستگیروی باری کە گەورەیە ، ناوی لەم نامەیەدا وەکو رەوشتی نامەنووسانە لە شیعری رابوردووان هیچ وەرنەگیرا . ( تاك ) :

غەرقەی کونی خوت بو لەبەرکردن    نەوەك کراسی ئەمانەت خواستن

زورتری ووتاری سەعدی شادی‌جوولینەرو خوشی تیکەلە . کورت‌بینان بەو هویەوە زمانی‌تانووتیان دریژکردووە کە موخی دەماخ بە بی‌سوود بردنو دووکەلی چرا بی‌کەلك خواردن ئیشی عاقلان نی‌یە . بەلام بو هوشی رووناکی‌ی خاوەن دلان کە رووی ووتار لـەوانە وون‌وداپوشراو نەبی کە دورری ئاموژگـاری تەواو کیشراوەتە هەودای عیارەتەوە وە دەرمانی تالی ئاموژگاریمان تیکەل بە هەنگوینی ووتاری جوان کرد هەتا تەبیعەتی ماندوویان لە دەولەتی قوبوول بی‌بەش نەبی .
( پارچە ) :

ئاموژگاریمان ئیمــە خستەدەر    روژگاریکمان تیــدا بردەسـەر
ئەگەر نەهاتە گوی ئارەزووی کەس    لەســەر پیغەمبــەر گەیاندنەو بەس

( پارچەیەکی‌تر ) :

| | |
|---|---|
| نازانی کە من لە خاکی غوربەت | بو روژگاری وا ئەگەرام درەنگ |
| لە تەنگی تورکان دەرچووم کە دیتم | جیهان یەکپاتوو هەر وەك مووی‌زەنگ |
| ئادەمیزادبوون بەلام هەموو وەك | گورگانی خوونخوار هەموو تیژچەنگ |
| هاتمەوە دیتم وولات سرەوتوو | پلنگ نەیماوە رەوشتی پلەنگ |
| دەروونی پیاوان فریشتە شیوە | بە دیمەن لەشکر هوزەبرانی جەنگ |
| لە کاتی خویا وابوو کە دیبووم | جیهان پرئاشووب پر تەشویش‌و تەنگ |

ووتم ئەم خاکە چون وەها سرەوت

پیاوی پی‌ی ووتم‌سەعدی‌ی شیواو رەنگ

| | |
|---|---|
| لە سایەی روژی پادشای عادل | ئەتابوك سەعدی ئەبوو بەکری زەنگ |

## تەواو

ستایشی‌و سوپاس بو پەروەردگار کە یارمەتی‌ی دام بو تەواوکردنی وەرگیرانی ئەم گولستانە بو هاونیشتمانانم، بو برایانی کوردم . داوائەکەم لە خوا رەواجی بداتی . هەر وەکو رەواجی بە گولستان بەخشی بە دەستی مصطفی صفوتی حاجی مەلا رسولی دیلیژەیی ئیمام‌و مودەرریسی مزگەوتی حاجی مەلا رســـول‌و خەتیبی خانەقای مەولانا خالد نووسرایەوە .

٢٧ ربیع الآخر ١٣٨١ بەرابەری ٦ی تەشرینی‌یەکەمی ١٩٦١ .

# فەرهەنگوکی ئەو ناوانەی لە گولستاندا هەن

## دوکتور عیزەدین مستەفا ئامادەی‌کردوە

( سەرەتا )

١ — سەعدیی شیرازی - ناوی شـــیخ موشریفەدینی کوری موسلیحەدینی سەعدیی‌یە . لە دەوروبەری سالی (٦٠٦)ی هیجریدا لە شاری شیراز لە دایك‌بووە. ئەستیرەیەکی گەشی ئەدەبیاتی فارس‌و جیهانە. بەشی زوری وولاتی ئیسلام گەراوەو شەقلی ئەو گەرانە کەوا ٣٠ سالی کیشاوە بە گولســــتانەوە دیارە . وا ئەزانم خویندنەوەی گولستان‌و بوستـــان وەلامی تەواومان دەربارەی ژیان‌و بیرو فەلسەفەو ئەدەبی ئەم پیـــاوە گەورەیەی میژووی بیری مروڤایەتی ئەدەنەوە . دەربارەی کوچی‌دوایی سالانی (٦٩٠ تا ٦٩٤)ی هیجری ووتراوە . بەلام هەر لە شــــیراز گیانی پاکی سپاردوەو لەوی نیژراوە .

٢ـــ سولەیمان - لە تەوراتا بــــە سولومون ناوی براوە بە پاشا ناسراوە ، کوری داوودە ، موسولمانان بە پیغەمبەری ئەزانن ، بە لای هەندی لەسەرچاوە فارسی‌و عەرەبی‌یەکانی میژووی سەدەکانی ناوەراستەوە ناوچەی فارس - ناوەراستی ئەو وولاتە بووە کە ئەم سولتانی بووە .

٣ـــ موزەفەرەدین ، ئەبووبەکر کوری سەعد کوری زەنگی (١٢٢٦ـ١٢٥٨)، پاشای فارس بووەو سەرپەرشتی‌ی شیخی سەعدیی کردووە .

٤ـــ ئوردوبەهەشت ، دووەم مانگی روژنامەی کونی ئیرانە کە ئیســــتاش بەکارئەهینری ، لە ٢١ی نیسانەوە تا ٢١ی مایسە .

٥ـــ جەلالی ( ل ١٧ ، د ١٣ ) ئەو روژنامە ئیرانی‌یە کونەیە کە لـە سەدەی یانزەهەمدا کاری پی‌ئەکرا . لە کاتی خویدا لە ئەستیرەگەرخانەی ئەسفەهاندا لەلایەن ئـەو دەستەزانا ئەستیرەگەرانـەوە کە زاناو شـاعیری بە ناوبانگ عومەر خــــەیام

رابەریان‌بوو ، ئەم روژنامەیەو ئەو سالنامەیەش دروست‌کرا کەوا ناوی جەلالەدین مەلەكشای پادشای سلجووقیی لی‌نرا ( ۱۰۷۰ ـ ۱۰۹۲ )

٦ــ نیگارخانەیی چینی ( ل ۱۸ ، د ۲۳ ) پەرستگای بوزی‌یەکانەو بە گەلیك پەیکەرودیمەن‌و وینە رازینراوەتەوە .

۷ــ نەخشی ئەرژەنگی ( ۱۸ ، د ۲۳ ) ، ئەرژەنگ كتیبی موقەددەسی مانی‌یەکانە . دانەری ئەم کتیبە نەخشەکیشی ناودارو دامەزرینەری ئاینی کونی ( مانوی )یە . مانی لە دەوروبەری سالی ۲۷۵ي زایینیدا کوژرا .

۸ــ سەعدی کوری ئەبووبەکر کوری سەعد کوری زەنگی ( ل ۱۹ ، د ٤ ) پادشای فارس‌بوو ، لە سالی ۱۲۵۸ دا جوانەمەرگ بوو ، هەموو دوانزە روژ فەرمانرەوایی‌کرد . گولستان بو ئەو نووسراوە ، بو سەعدي کوري زەنگی کە مامی ئەمەو لە سالی (۲۲٦)دا مردووە نەنووسراوە . هەرچەندە بە لای زور کەسەوە وایە

۹ــ ئەبووبەکر کوری ئەبوونەسر ـ ( ل ۱۹ ، د ٥ ) وەزیری پادشای فارس ئەبووبەکری کوری سەعدی کوری زەنگی بووە .

۱۰ــ بوزورجومهور ( ل ۲۰ ، د ۸ ) وەزیری پادشا خوسرەوی ئەنوشیروانە ( ۵۳۱ ـ ۵۷۹ )ی زایین . لە زور داستانا ئەم وەزیرە وەك داناو راویژکەری پادشا پیشان‌ئەدری .

۱۱ــ چیای ئەلوەند ( ل ۲۰ ، د ۲۰ ) لوتکەیەکی چیایە ( ۳٤۰۰ م ) ، زنجیرە شاخیکیشە لە باکووری هەمەدان .

۱۲ــ کەنعان (ل۲۰ ، د۲۳) لە ئینجیلا بە نیشتمانی یوسفی جوان دائەنری .

بەندی یەکەم : (۱) مەحموودی کوری سەبوکتەگین ( ل ۳۷ ، د ۷ ) سولتانە ( ۹۹۸ـ۱۰۳۰ ) دامەزرینەری دەسەلاتی بەتینی غەزنەوی‌یەکانە . (۲) نەوشیرەوان ( یا نەوشیروان یا ئەنوشیروان ) « ل ۲۳ ، د ۱۵ » شیوەیەکی کونی ناوی ئەنوشیر-

وانی پاشای ساسانی‌یە (٥٣١ـ٥٧٩) . (٣) توور ـ « ل ٣٢ ، د ٢٢ » چیای‌توورە لە سینا ، کە لای جولەکەو موسولمان پیروزە . (٤) هوما « ل ٢٥ ، د ٣ » مەلبکە ، لە ئەفسانەدا ئەلین بەختەوەری ئەدات بە پیـــاو ، وە هەر کەس سیبەری هومای لی‌کەوی ئەبی بە پاشا . (٥) یونس « ل ٢٦ ، د ١ » لە ئینجیلا بـــە ئیون ناوی ئەبری . ئیسلام بە پیغەمبەری ئەناسی . (٦) ئوغلەمیش « ل ٢٨ ، د ٣ » لە نەوەی ئیلدیگیزیدە ئازربایجانی‌یەکانە ، لـــە « ١٢٣٧ـ١٢٥٠ »ی زایینیدا فەرمانرەوای هەمەدان‌بووە . (٧) هورمز « ل ٣١ ، د ٥ » ئورموزی چوارەم « ٥٧٨ـ٥٩٠ » لە پاشایانی ساسانی‌یە ، کوری نەوشیروانە . (٨) خاون دیوان « ل ٣٨ ، د ٢٠ » لەقەبی وەزیر شەمسەدینی جوەینی‌یە کە سەرپەرشتی‌ی سەعدیی کردوەو ئەمیش کتبی « صــاحیبە »ی پیشکەش بەو کردووە . (٩) قاروون « ل ٤٢ ، د ١٢ » دەولە ـ مەندیکە لـە ئەفســانەدا ئەلی کەوا زەوی لە رژدی‌و پیسکەیی‌دا قووتی‌دا (١٠) عەمری کوری لەیس ( لیث ) « ل ٤٥ . د ٧ » یەکیکە لـە فەرمانرەواکانی ( سەفـار )ی « ٨٧٩ ـ ٩٠٠ » . (١١) زەوزەن « ل ٤٧ ، د ١ » ناوچەیەکە لە خوراسان . (١٢) زەنوونی میسری « ل ٥١ ، د ١ » خواپەرست‌و موتەسەویفیکی بەناوبانگە . (١٣) مەلاتی‌یە « ل ٥٢ ، د ٨ » شاریکە ئیستا ئەکەویتە کوردستانی تورکیاوە ، وا دیارە لە زەمانی سەعدی‌یا گاوری یونانی‌ی تیاژیاوە . (١٤) ئەنوەری « ل ٥٢ ، د ٩ » ئەوحەدەدین ، عەلی کوری ئیسحاق ، ئەنوەری‌ی ئەبیوردی ، شاعیریکی ناوداری فارسە ، ستایشی نووسیوە ، لە سالی «١٨٨٩»ی‌زایین‌دا مردووە (١٥) کیسرا « ل ٥٥ ، د ٢ » ، کردنە عەرەبی‌ی ناوی (خەسرەو)ە کە لەقەبی پاشایانی ساسانی‌بووە . لیرەدا مەبەس نەوشیروانە . (١٦) مورداد « ل ٥٦ ، د ٨» مانگیکە لە سالی ئیرانیدا لە «٢٣»ی تەمووزەوە تا «٢٣»ی ئاغستوس .

بەندی دووەم : (١) عەبدولقـادری گەیلانی « ل ٥٨ ، د ١٨ » دامەزرینەری

تەریقەتی قادرییە ، سالی « ١١٦٦ »ی زایین وەفاتی کردووە ، سەعدی لە بەغدا لای قوتابیانی ئەو خویندوویەتی . (٢) جوبرەئیل و میکایل ناوی دوو فریشتەن و حەپسەو زەینەب ، خیزانی پیغەمبەرن ( س.خ ) « ل ٦٣ ، د ١٢ » . (٣) مەبەس یاقووب پیغەمبەری باوکی ( یوسف )ە «ل ٦٤ ، د ٤ » . (٤) پیری کەنعان «ل ٦٤ ، د ٥ » ئەو پیرەیە کە بە پێی ئینجیل و قورئان ، حەزرەتی یوسفی ، خرایەناو . (٥) بەعلەبەك «ل ٦٤ ، د ٩» شاریکە لە لوبنان . (٦) نەخلەی مەحموود «ل٦٧ ، د ١٣» شوینی وەستانی کاروان بووە لای روژهەلاتی «مەکە»وە . (٧) ئەبولفەرەجی جەوزی « ل ٦٨ ، د ١٩ » جەمالەدین ئەبولفەرەج ، عەبدوروەحمان کوری موحیەدین یوسف کوری جەمالەدین ئەبولفەرەج کوری ئەججەوزی « ١١٨٦ - ١٢٥٧ » ماموستای سەعدی و موحتەسیبی بەغدا بووە . چونکە سەعدی لە یەکەم دیری ئەو چیروکەدا ناوی بردووە ، بویە لای زورکەس لەگەل ناوی باپیریا کە نەحوی و زاناو زمانەوان و میژوونووس و واعیز ئیبن جەوزییە « ١١١٦ - ١٢٠١ » تیکەلاو بووە . (٨) عوششاق ، نەهاوەند ، حیجاز « ل ٧٠ ، د ٢١ » . سی مەقامن لەو «١٢» مەقامەی لە گورانیی کلاسیکیی فارسیدا زانراون و کوردو عەرەبیش وەریانگرتوون . (٩) مەن « ل ٧١ ، د ٧ » لیرەدا مەنی عەرەبییە کە دوو رەتل واتە ٩٠٠ غم ئەکات . (١٠) بەنی هیلالی : « ل ٧٣ ، د ١٥ ) تیرەیەکی عەرەبی بەدووە . (١١) بارام «ل ٧٥ ، د ٧» بارام بە پاشایەکی ئازاو بەخشندە ناسراوە . بەلام لیرەدا باس لەو ئەفسانەیە ئەکری کە ئەلی میلوورە قاچی کوللەیان بە دیاری بو حەزرەتی سلیمان هینا . (١٢) تەرابلوس - شاریکی سوورییە «ل ٧٦ ، د ١٤» وە فەرەنگ لیرەدا مەبەس خاچپەرستانە « ئەهلی سەلیب » کە لەو کاتەدا ئەو ناوچەیەیان داگیرکردبوو واتە لە چلەی سەدەی سیانزەهەمدا . (١٣) سەرەندیب « ل ٨٦ ، د ١٠ » سیلان .

بەندی سیەم : (۱) عەزیزی میسر « چ ۲ » ئەوکەسەیەکە کاروباری دراوو درامەتی لە میسرا بردووە بەریەوە . (۲) ئەردەشیری بابکان « ۲۲٦ ـ ۲٤۱ » دامەزرینەری خانەدانی ساسانیە « چ ٥ » . (۳) واسیت ـ واسط ـ شاریکی عیراقە لە نیوان کووفەو بەسرەدا « چ ۹ » . (٤) تەتار « چ ۱۰ » . لە زەمانی شیخی سەعدییا بە داگیرکەرانی مەغول ووتراوە . (٥) کیش «ل ۹۹ ، د ۱۳» . دورگەیەکە لە خلیجیفارسدا . (٦) گوور «ل ۱۰۰ ، د ٥» جیگەیەکی شاخاوی سەختە ئیستا ئەکەویتە بەشی روژاوای ئەفغانستانەوە . (۷) موسەلای شیراز « چ ۳۰ » ، شوینی نویژە لە شیراز ، باخچەیەکی بە ناوبانگە لە دەرەوەی شار ، لای گورستان . (۸) گومەزی عەزود ـ ادەولە « چ ۳۰ » زیارەتگایەکە لە قەراغ شاری شیراز ، لەویدا عەزودلدەولەی بوەیهی نیژراوە ، کە لە ۹٤۹ تا ۹۸۳ فەرمانرەوای فارس و عیراق بوو .

بەندی چوارەم : (۱) جالینووس « ل ۱۱٤ ، د ۱۹ » پزیشکیکی ناوداری رومانەو زانای سروشتبووە لە دەوری « ۱۳۰ ـ ۲۳۰ »ی زایینىدا ژیاوە . (۲) سوحبانی وائیل « ل ۱۱٥ ، د ۸ » خەتیبیکی ناوداری عەرەب بووە «سەدەی حەوتەم» . (۳) حەسەن مەیمەندی ـ وەزیری سولتان مەحموودی غەزنەوی بوو « ل ۱۱٥ ، د ۱۸ » . (٤) ئیستەخر « ل ۱۱۷ ، د ٥ » پایتەختی کونی فارسە ، بە خانووی بەرد ناوی دەرکردووە . (٥) مزگەوتی سنجار « ل ۱۱۷ ، د ۱۹ » وا ئەزانم باسی ئەو مزگەوتەیە کە سولتان سنجەر لە شاری سنجار « شنگار »دا دروستی کردوە . ئەو سولتانەی لە نیوان « ۱۱۱۸ تا ۱۱٥۷ »دا فەرمانرەوا بووە .

بەندی پینجەم : (۱) ئەیاز « ل ۱۱۸ ، د ۱۷ » کویلەیەك بووە کە سولتان مەحموود خوشیویستوە ، لە ناو کوردا بە هەیاسی خاس بەناوبانگە . (۲) تالشالی « ل ۱۲۰ ، د ۲۲ » دەرمانیکی تالە پزیشکانی کون زوریان بەکارهیناوە .

(٣) مەحموودی زەمەخشەری « ١٠٧٥ ـ ١١٤٤ » زانایەکی گەورەیە ، گەلیك کتێبی لە زمانو تەفسیردا نووسیوە لەسەرڕێبازی موعتەزیلەبووە « ل ١٣١ ، د ٥ »
(٤) زەیدو عەمر « ل ١٣١ ، د ٦ » دوو ناوە بە زۆری لە نەحوی عەرەبیـــدا ئەکرێ بە نموونە . (٥) خوفاجە ناوی تیرەیەکی عەرەبە « ل ١٣٣ ، د ١ » .

بەندی حەوتەم : (١) بامیـان شارێکی کۆنە لە نێوان بەلخو هیندستانا .
(٢) ســالح « ل ١٦٤ ، د ١٦ » ناوی پێغەمبەرێکە کە حوشترەکەی موبارەکە . دەجالیش پێغەمبەرە دروزنەیەکە بە سواری کەر ئەگەڕێ .

بەندی هەشتەم : بیلەکان « ل ١٧٤ ، د ٧ » شـارێکی کۆنە لە ئازربایجـان .
(٢) مەردەشت « ل ١٧٧ ، د ٢٦ » یەکێکە لە ٣ ناوچەکەی فارس . (٣) جەمشید « ل ١٩٣ ، د ١٠ » پاشایەکی ئەفسانەی ئێرانییە وەك ئەلێن خەلکی فێری هونەری بەرگدروونو مەعدەنسازکردن کردووە .

## خوێنەری بەڕێز :

پاش گەڕانەوە نیشتمان ویستم بەرهەمەکانی باوکی کۆچ کردووم چاپ بکەم . نووسینەوەیان یەکەم کۆسپ بوو ، کورد ئەڵێ : شـــەڕی‌و خێری مێ تیابێ . ئەوســا برای ئەدیبو خۆشەویستم محەممەدی مەلا کەریم بەندکرابوو ، کاتی هەبوو ، گولستانی بە جوانی نووسییەوە . هونەری چاپو سوپاس هەر بۆ ئەوە . چاپخانەکانی بەغداش لە گرانیو ناڕاستیی زۆربەیاندا کۆسپی دووەمن ، کوردی چاپکردن خوێنسـاردیو وەڕس نەبوونی ئەوێ . لـەبەر ئەم هۆیە ئەبێ لـــە کەمو کوڕی ببورن ، هەرچۆنێ بێ ئەم بەرهەمەم لـــە ڕەشنووسی ڕزگارکردوگیانی پاکی خـاوەنو وەرگێڕیم‌پێ‌شادکرد . لە دواڕۆژا هیواداری چاپکردنیجوانو پوختەتریوچاپیبەرهەمەکانی تری وەرگێڕم .

« ع. م. ر »

